- ناوی کتێب: چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی ئەوروپا
- بابەت: مێژوو
- نووسەر: سەباح عەلی جاف
- نەخشەسازی و بەرگ : لاوان ئەحمەد
- هەڵەچن : روخسار محەمەد
- چاپ : یەکەم ٢٠١٤ ز . سلێمانی
- چاپ: چاپخانەی کەمال
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- نرخ : ٣٠٠٠ هەزار
-

ژمارەی سپاردن : لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان ژمارە (          ) ی ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە

لەسەر ئەرکی نێچیرڤان بارزانی

سەرۆکی حوکمەتی هەرێمی کوردستان چاپ کراوە

# ناوەڕۆک

پێشەکی ......... ل ٤
١-.- دەروازەی یەکەم | مێژووی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا.. ل٧
٢ .- دەروازەی دووەم | چاکسازی ئاینیی.......... ل٤٣
٣ . دەروازەی سێیەم | ناپلیۆن لە ڕۆژهەڵات.................. ل٨١
٤ . دەروازەی چوارەم | فەلسەفەی مێژوو لای چوار فەیلەسوفی ئەوروپی ل٩٧

# پێشەکی

**بەناوی خوای گەورەی بەخشندە**

مێـژوو وەک یـەکێـک لـە بابـەتـە دێرینـەکـانی ژیـانی مـرۆڤ و زانـستێکی سەردەمەیانە رەنگە بە درێـژای مێـژووی مێـژوو ، ئـەم زانـستە قـسەی زۆری لەسەر کرا بێت چ وەک رووداو چ وەک بابەت و زانست و فەلسەفە کە رەنگە ئەم زانستە بە شێوەیەک لە شێوەکان لە ژیانی هـەر یـەک لـە ئێمـەدا گرنـگ بێت واتا مرۆڤ لە هەر پلە و لە هەر ئایدیا و بۆچون و قۆناغێکی ژیاندا بێت پێویستی بە خوێندنەوە و لەسەر وەستانی بۆ مێژوو هەیە و بووە .

مێژوو لە ئێستادا وەک لقێک لـە زانـستە مرۆڤایـەتیـەکـان جێگـەی بایـەخـی هـەمـوان و زۆر جـاران قـسە لـەسـەر مێـژوو کـراوە کـە هـەنـدێک بـە بـاوکی زانستەکانی تر و هەندێکی تر بە زانستی زانستەکانیان پێناس کـردووە و بـە راستی ئەم زانستە بۆ هەموو زانستەکانی تر دەروازە و بنچینـەیـەکـی گرنگـە وە هەر تاکێکی نەتەوە لـە مێـژووی خـۆی و دواتـر مێـژووی دەرەوەی خـۆی تێنەگات رەنگە لە ژیانی رۆژانەیدا توشی ئیشکالی گەورە بێت هەر بۆیە لـەم سۆنگەیەوە گرنگە هەموو تاکێک خوێنەرەێکی جدی مێژوو و رابردووی بـوون بێت بە تایبەت رابردووی مرۆڤ بەم پێیەش دەتوانێت باشتر لە ژیان و بوون تێ بگات ، مێژوو چەندین لق و جۆری هەیە کە دەکرێت بۆ ئاسـتی نـاوخۆی و دەرەوی بوونی هەر نەتەوە و میللەتێک سەیر بکرێت واتا هەر نەتـەوەیـەک پێویـستە مێـژووی نـاوخۆی خـۆی بزانێـت و ئاگـای لـە رابـردووی دەرەوەی خۆشی بێت بۆ ئەمەیش زۆر رێگە هەیە بۆ بەئاگابوون لە مێـژوو بـە تایبـەت مێژووی دەرەوە لە رێگە جۆر بە جۆرەکانی وەک وەرگێـڕان یـان لێکۆڵینـەوە یان گێڕانەوە یان هەر جۆرێکی تر .

ئەم کتیبَبەی بەردەست هـەوڵێکـی بچـوک و سـەرەتایـە بـۆ بـە ئاگـابوون لەسـەر چـەنـد لاپـەڕەیـەک لـە مێـژووی ئـەوروپـا وەک بـەشـێک لـە مێـژووی زیندووی جیهان واتا هەر بابەتێکی مێژووی کە کارێگەری لەسەر رەوتی ژیان

هەبێت بە بڕوای من زیندووە و وەک ئەوە وایە بەردەوام ئەو روداوە زیندوو بێت و ببێتە مایەی لەسەر وەستان ، ئەم بەرهەمە لە چوار دەروازە پێک هاتووە کە هەر دەروازەیکیان چەند بەش و تەوەرێک لە خۆی دەگرێت کە خۆی لە خوێندنەوەی کتێب و لێکۆڵینەوەدا دەبینێتەوە .
دەروازەی یەکەم تایبەت بەو کتێبە وەرگێڕدراوەی مامۆستا مستەفا سەعید لەسەر چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕستدا کە لە عەرەبیەوە کراوەتە کوردی و پێشکەش بە خوێنەری کورد کراوە و منیش بە شێوەیەکی بابەتی خوێندەوەیەکم بۆ کردووە و لێرەدا خستوتە روو بە شێوەیەکی کورت و پوخت کە دەکرێت خوێنەر بۆ زۆر تر ئاشبوونی بۆ سەرچاوەکە بگەڕێتەوە ، دەروازەی دووەم لە دوو بەش و چەند تەوەرێک پێک هاتووە کە تایبەتە بە چاکسازی ئاینی مەسیحی کە ئەم بابەتە لە مێژووی ئەوروپادا بابەتێکی گرنگەوە و رۆڵ و پێگەی خۆی هەیە و بوەتە دەرگا و رێگای زۆر بابەتی تر و کارگەری لەسەر نەک ئەوروپا بەڵکو تەواوی جیهان لە کاتی خۆی و تا ئێستایش هەیە و بە شێوەیەکی تا رادەیەکی بابەتی قسە لەسەر ئەو ریفۆرمە کراوە ، دەروازەی سێیەم بریتیە لە هێرش و لەشکرکێشی ناپلیۆن و فەرەنسا بۆ سەر رۆژهەڵات بە گشتی و وڵاتی میسر بە تایبەتی و و لەم لێکۆڵینەوەیەدا قسە لەسەر زۆر رەهەندی ئەم هێرشە کراوە بە شێوەیەکی کورت و پوخت ، دواین دەروازە و چوارەمینیان لە لێکۆڵینەوەیەکی زانستیدا باس لە زانست و فەلسەفەی مێژوو کراوە و بۆچونی چوار فەیلەسوفی ئەوروپی کارگەر و گرنگ بۆ مێژوو و ژیان خراوەتە روو وەک ( ڤۆڵتێر ، شپلنگەر ، ڤیگۆ و هێگڵ ) کە بە شێوەیەکی گشتی رای ئەو فەیلەسوفانە لە مەڕ زانست و فەلسەفەی مێژوو باس کراوە ، لە هەموو ئەو بەش و تەوەرانەی کە باس کران سود لە چەندین سەرچاوە وەرگێراوە بە تایبەت کە لە زمانی کوردی و عەرەبیدا هەیە و وە لە زۆر

زمـانی تـرەوە بـۆ ئـەو دوو زمانـە وەرگێـڕدراون وەک فارسـی و ئنگلیـزی و فەرەنسی و ئەڵمانی و سودیش لە سایتەکانی ئەنتەر نێت وەرگیراوە .
ئومێدەوارم ئـەم هـەوڵـە بتوانێـت هـەندێک زانیاریتـان پـی ببـەخـشتێت لـەو بابەتانەی کە باس کراون و بێگومانیشم هیچ هەوڵێک بێ کەم و کوڕی نابێت بۆیە لەو رووە هەر هەڵەیەک هەبوو بە ئومێدم بـە چاوی رەخنـەی دروسـت کار بخرێتە روو ، سوپاسیش بۆ هەموو ئەوانەی کە لەم بـەرهـەمـەدا هاوکـار بوون و گەر هەوڵەکانی ئەوان نەبوایە رەنگە ئەم بەرهەمـە بـەم شـێوەیـە بـە چاپ نەگەیشتایە ، هیـوام سـەرکـەوتـن و خوێندنـەوەیـەکـی نـوێ و جدی و رەخنەگرانەیە بۆ هەر روداو و بابەتێک لە ژیان کە سودی هەمـوانی تێدایـە و بە هیوام مێژوو تەنها تۆماری روداوەکانی رابردوو نەبێت .

**سەباح عەلی جاف**

٢٠١٤/١/٣٠ کەلار

## دەروازەی یەكەم

# مێژووی ئەوروپا لە سەدەكانی ناوەڕاستدا




لە سادەترین پێناسەدا بۆ مێژوو ئەوەیە کە تۆماری ڕووداوەکانی رابردووە یان گێڕانەوەی ئەو رووداو بەسەرهاتانەیە کە بەشێوەیەک لە شێوەکان لە کاتێکی دیاریکراودا رووی داوە ، بێگۆمان هەر نەتەوەیەک بۆ خۆی خاوەن مێژوو و دیرۆکی خۆیەتی بەڵام بۆ ئاشنابوون بە مێژووی گەلانی تر پێویستە تاکەکان لەو رووەوە شارەزا ببن بە مانایەکی ترپێویستمان بە وەرگێڕان و قسە لەسەر کردن بە تایبەت لێکۆڵینەوە بۆ شرۆڤە و تێگەیشتن لە مێژووی گەلانی تر بە شێوەیەک زۆر ترین تاک سود لە ئەزمونی مێژووی گەلانی تر وەر بگرن .

ئێمە وەک نەتەوەی کورد پێویستی زۆرمان بە ئەزمونی گەلانی تر هەیە بە تایبەت روداوە مێژوویەکان بۆ ئەوەی لە ئێستادا سودی لێ ببینین ، یەک لەو رێگانەی ئێمە دەتوانین ئاشنای مێژووی بین وەرگێڕانە بە تایبەت

مێژووی گەلانی دراوسێ و نەتەوەکانی تر بەگشتی وە لە نێویشیاندا مێـژووی ئەورپایە بە هەرسێ قوناغی ( کۆن ، ناوەڕاست ، نوێ و هاوچەرخ ) .
یەکێک لەو هەولانەی کە دراوە بۆ ئاشناکردنی نەوەی ئێستا بـۆ بـەشـێک لـە مێژووی ئەوروپا ، کتێبە وەرگێـڕدراوەکـەی مامۆسـتا مـستەفـا سـەعیـدە کـە دەکرێـت خوێنــەر سـودی لـێ وەرگرێـت بـۆ ئاشـنابوون بـە گـەلێـک رووداو ئەزمونی ئەوروپا لەو دەمەدا ، لێرەدا بە شێوەیەکی خێرا گوزەرێک دەکـەیـن بە کتێبەکەدا و هەوڵ دەدەم خوێندنەوەیەکی بابەتی بۆ کتێبەکە بکەم .
کتێبی ( مێژووی ئەوروپا لـە سـەدەکـانی نـاوەڕاسـتدا ) لـە هـەشـت بـەشـی سەرەکی پێک هاتووە کە هەر بەشەی تایبەتـە بـە مێـژوو و رووداوێـک و لـە هەریەکە لەو بەشانەدا تیشک خراوەتە سەر چەنـدین بابـەت کـە لـە روخـانی ئیمبراتۆریەتی رۆمانی لە رۆژئاواوەوە دەسـت پـێ دەکـات و لـەو مێـژووە شـۆڕ دەبێتەوە بۆ چەند بابەتێکی تر تا دەگاتە دوا بـەش ( هـەشـتـەم ) بـاس لـە جەنگی خاچ پەرستەکان  و پاڵنەر و هێرشەکان دەکات .

### ✓ بەشی یەکەم

بەشی یەکەمی کتێبەکە تایبەتە بە هۆکاری لاوازی ئیمبراتۆریـەتـی رۆمـانی و چەند بابەتێک خراوەتە روو کە لاپەڕە ( ١١- ٢٦ ) ی کتێبەکەی بۆ تەرخان کراوە ، لەم بەشەدا و لە سەرەتاوە وەک پێشەکیـەک بـاس لـە هۆکـارەکـانی لاوازبوون و روخـانی ئیمبراتۆریـەتـی رۆمانیـا " ئۆغـستس " کـە نزیکـەی ٤٥ ساڵ حوکمڕانی کردووە ( ٣١ پ . ز – ١٤ ز ) مێژوونوسان ئەو سەردەمەی ئۆغستس بە کۆتای ئیمبراتۆریەتی رۆما دادەنێن هەر چەنـدە ئـەو لـە هێنانـە کایەی جۆرێک لە دەسلات ( حوکمی پاشایەتی و کۆماری ) دا سەرکـەوتـوو بوو ، ئۆغستس گەلێک کاری چاکی کرد لـە مـاوەی حـوکمڕانی خۆیـدا چ لـە رووی سیاسیەوە بە تایبەت شێوازی بڕێوەبردن هاوکـات تـوانی گـۆڕانیش لـە ئـاینی رۆمـانی کۆنـدا بکـات ، هـەر لـەم بـەشــەدا تیـشک خـراوەتـە سـەر

هۆکارەکانی لاوازبوون و روخانی ئیمبراتۆریەت کە سەدەی سێیەمی زاین بە کۆتای ئەم رژێمە دانراوە و هۆکارە سیلسی و ئابوری و کۆمەلایەتیەتی و ئەخلاقیەکان باس کراون کە کاریگەر بوون لە روخانی ئیمبراتۆریەتدا و لە هۆکاری سیاسی و سەربازیدا تیشک خراوەتە سەر گەلێک خاڵ ( کێشەی بە میرات گرتنی عەرشی رۆمانی لە هۆکارە سەرەکیەکانی پشێوی سیاسی و نا ئارامی ئیمبراتۆریەت بوو ) و لە کێش مەکێشەی دەسلاتدا زۆر جار سوپا دەهاتە دەنگ و کار دەگەیشتە ئەوەی کە مالۆێرانی سەرانسەری وولات بگرێتەوە ئەمە جگە لەوەی کە هاتنی نارۆمانیەکان بۆ خزمەتی سەربازی و دوورکەوتنەوەی رۆمانیە نەژادەکان لە خزمەتی سەربازی کە گیانی ناوچەگەرێتی زیندوو کردووە هۆکارێکی ترە کە خراوەتە روو جگە لەمە هێرش و ترسی دەرەکی وەک لە رۆژهەلاتەوە " ساسانیەکان " و لە رۆژئاوایشەوە هۆزە جەرمانیەکان .

لە هۆکارە ئابوری و کۆمەلاییەتیەکاندا ئەوە خراوەتە روو کە ئەم دوو پالنەرە زۆر رون نین بۆ روخانی ئیمبراتۆریەت بەلام کوشتار و جەنگ کاریگەری لەسەر کەم بوونی هاولاتیان هەبوو کە ئەمەیش کاریگەری لەسەر بەرهەم هێنان و نەکێلانی زەویەکان هەبوو و هەروەها کەشتیوانی لە دەریای ناوەڕستدا بە هۆی چەتە دەریایەکانەوە کەوتە بەرمەترسی واتا بەرهەمی کشتوکالی و پیشەسازی بە تەواوەتی پەکی کەوت و ئەمە وای کرد کە چینی جوتیار و دەرەبەگ دەربکەوێت کاریگەری زۆری بۆ سەر ژیانی ئابوری و کۆمەلایەتی هەبوو، هەر لەم بەشەدا چەند هۆکارێکی تری وەک هۆکاری ئیداری و دوور کەوتنە لە بەهاو و رەوشت بۆ روخانی روما باس کراوە ، لە دوا بەشی بەشی یەکەمدا تیشک خراوەتە سەر چاکسازیەکانی داقیانوس و ئەنجامەکانی ئەو پرۆژە .

داقیانوس لە سالی ٢٨٤ی زاینی هاتە سەر حوکم و تا سالی ٣٠٥ی زاینی مایەوە لە دوو خالدا کاریگەر بووە بۆ مێژووی رۆم ئەویش ( ١- پێک

هێنانی سوپای رۆمانی لە کەسانی نارۆمی ، ٢ – ئەو رۆڵەی کە سوپا دەبینی لە سیاسەتی رۆمدا ) و ئەویش باس کراوە کە داقیانوس لە باوکێکی جوتیار لە دایک بووە و لە رێگەی خزمەتی بۆ سوپا گەیشتوەتە ئیمبراتۆریەت هەر بۆیە زۆرێک لە کارەکانی لەو بوارەدا رەنگی داوەتەوە ، لە کارە گرنگەکانی کە ئاماژەی پێ دراوە وەک " ئەنجومەنی پیرانی گۆڕی بۆ ئەنجومنی شارەوانی ، تەواوی دەسلآتەکانی خستە ژێر دەستی خۆی و دەزگایەکی ئیداری گەورەی دامەزراند ، دیاردەی سیستەمی کۆماری لەناوبرد و رژێمێکی دیکتاتۆری جێگەی گرتەوە ، کۆشکێکی مەزنی دروست کرد و زۆر گرنگی پێ دەداو رازاندیەوە ، ئیمراتۆری کردە دوو بەشەوە ( ئۆغستسی و قەیسەر ) ، دانانی هەندێک ئیمتیاز بە تاکەکان و کارمەندانی حوکمەت لەوانە بوراندنیان لە باج ودابەش کردنی زەوی بەسەریاندا ، دروست کردنی سوپایەکی بەهێز لە رومانیەکان و غیرە رۆمانیەکان ، رێکخستنی خاوەن پیشە جیاوەزەکان لە سەندیکای خۆیاندا ، بە پێی مەرسومی میلان لە ساڵی ٣١٢ قوستەنتین دانی نا بە ئاینی مەسیحیەتدا ، دروست کردنی شارێکی نوێ لە شوێنی شاری بیزنتەی کۆن وەک پایتەختێکی نوێ ...".

### ✓ بەشی دووەم

بەشی دووەمی کتێبەکە تایبەتە بە ئاینی مەسیحیەت و بڵاوبونەوەی ئەو ئاینە کە لاپەڕە ( ٢٧ – ٤٠ ) ی کتێبەکەی بۆ تەرخان کراوە و لە سەرەتادا باس لە پاشاخانی ئاینی مەسیحیەت دەکات کە چۆن دروست بووە و نیشانە بۆ ئەوە کراوە کە ئاینی مەسیحیەت لە فەلەستیندا سەری هەڵداوە و پاشان زۆر بە خێرای بە رۆژهەڵات و رۆژئاوای ئیمبراتۆریەتی رۆمانیدا بڵاوبووتەوە ئەمیش بە هۆی سروشتی پێک هاتەی رۆما و پێکەوە بەسترانی رێگاوبانەکان هەروەها سروشتی ئاینی موژدەهێنی مەسیحی کە خێرا بڵاو

بووە ، مەسیحیەت سەرەتا لە نێو هەژاراندا بڵاو بوەوە پاشان هەموو چین و توێژەکانی گرتەوە و هۆی سەرکەوتنی ئاینەکەیش بۆ ئەو دەستەو تاقمە دەگەڕێتەوە کە بە قوتابیە نزیکەکانی مەسیح کە پێیان دەوترێت پێغەمبەران و حەوارییەکان ، لێرەدا تیشک خراوەتە سەر " قەدیس پۆڵس " کە پیاوێکی یەهودی بووە لەسەرەتاوە پاشان باوەڕی بە دینی نوێ هێنا و بە هۆی رۆشنبیری زۆریەوە کاریگەری هەبوو لە بڵاوکردنەوەی مەسیحیەتدا و نەبونی ئاینێکی گشتگیر و بۆشاری رۆجی وای کرد ئەم ئاینە بە خێرای تەشەنە بکات .

**هێناوەی رای پرۆفیسۆر ا . س . هۆدیت هەر لەم بابەتدا کە باس لە سێ تایبەت مەندی دەکات بۆ ئەوەی کە ئاینی مەسیحیەت بە سەرکەوتوی بمێنێتەوە :**

١ – باوەڕی رەهای مەسیحبەکان بە ئاینەکەیان ، ٢ – جیا کردنەوەی خۆیان و ئاینەکەیان لە کەسانی تر کە یەک خوایان پەرستووە ، ٣ – سوربوون لەسەر ئەوەی کە لە خوا زیاتر هاوار بۆ کەس نەبەن و بە چەندین ووتەی قەدیس و دڵسۆزانی ئاین باس لە گرنگی ئاینی مەسیح کراوە لەوانە ( ئەوەی بۆ قەیسەرە با بۆ قەیسەر بێت ، ئەوەیشی بۆ خوایە با بۆ خوا بێت ) .

هەڵوێستی حوکمەتی رۆمانی لە ئاینی مەسیحی بابەتێکی ترە لەم بەشەدا کە بە سەردەمی چەوساندنەوە ناوی هاتووە – ساڵی ٣١٣ ز ، هەرچەندە حوکمەتی رۆمانی سیاسەتی لێبوردەی و نەرمونیانی بەرامبەر ئاینە جیاوازەکان هەبوو بەڵام لە بەرامبەر بڵاوبونەوەی ئاینی مەسیحیەتدا زۆر بە توندی وەستایەوە لەبەر چەند هۆیەک لەوانە :

١ – زۆربەی مەسیحیە یەکەمینەکان لە شارە گەورەکاندا نیشتەجێ بوون و لە خەڵکی دابڕاوبون مەیش ترسی لای دەسڵات دروست کرد .

٢ – نەپەرستنی ئیمبراتۆر کە مەسیحیەکان پەرستنیان بە بتپەرستێکی قێزەون دەزانی ئەمە لە کاتێکدا کە پەرستنی ئیمبراتۆر لە لە ئاینە کۆنەکاندا یەکێک بوو لە کۆڵەکەکانی دەسلات .
مەرسومی میلان لەم بەشەدا تیشکی خراوەتە سەر بە نیسبەت ئاینی مەسیحیەتەوە زۆر گرنگە چونکە بە بەستنی ئەم مەرسومە ئاینی مەسیحیەت بە فەرمی ناسرا و پاش زۆربونی شوێنکەوتوانی ئاینی مەسیح لە سەردەمی قوسستەنتیندا لە ساڵی ٣١٣ ز بە پێی مەرسومی میلان بوو بە یەکێک لە ئاینە دان پێدا نراوەکانی ئیمبراتۆریەت و بۆ دان پێدانانی ئەو سەرکردەیە باس لە چیرۆکی خەیاڵی دەکرێت و تا ئێستا ئەمە رون نیە ، بەو شێوەیە ئاینی مەسیحەت لە هەڵکشان و داکشاندا بووە تا لە سەردەمی تیۆدسیۆسدا ئاینەکە بەرز کرایەوە بۆ ئاستی ئاینە فەرمیەکانی تری دەوڵەت .
بلاوبونەوەی مەسیحیەت لە ماوەی هەردوو سەدەی چوارم و پێنجەمدا ، لەم بابەتەدا باس لە خێرا بلاو بوونەوەی ئاینی مەسیحی و دانانی سیستەمی " کەهەنوتی و پاپا و قەشەکان " دەکات و چۆنیەتی درێژە دان بە کارو چالاکیەکانی مەسیحیەت پاش هەرەس هێنانی ئیمبراتۆریەتی رۆمانی لە سەدەمی پێنجەم و شوێن گرتنەوەی ئەو ئیمبراتۆریەتە لە ئەوروپا ، ئاینی مەسیحیەت توانی فراوانخوازی هەبێت لە رۆژهەلات و رۆژئاوای ئەوروپا پێ بە پێ بەلام ئەوە نابێت لە بیر بکرێت کە لە رۆژهەلاتدا بوونی دەسلاتێکی بەهێز وای کرد کە کەنیسە مل کەچی بێت بەلام لە رۆژئاوا بە پێچەوانەوە
لە دوا بەشی بەشی دووەمدا باس لە هەرتەقە ( بیدعە ) کراوە کە زۆرێک لە ئاین و سیستەمەکان روبەڕووی دەبنەوە کە ئاینی مەسیحیەتیش بێ بەش نیە لەو گرفت و ئاریشانە ، مەسیحەت هەر لە سەرەتاوە توشی چەندین بزوتنەوەی لێ جیابووە بوو کە هەرتەقە یەک لەوانە مەبەستیش ئەوەیە کە ( دەرچونە لەو بیروباوەڕەی کە کەنیسە دانی پێدا ناوە ، یان دەرچونە لە بەشێک لەو بیرو باوەڕە ) بیروباوەڕی سالوس گرفتێک بو بە تایبەت ئەو

پرسیارەی کە بەردەوام هەبوو لەسەر سروشت و کەسایەتی مەسیح و پەیوەندی بە باوکیەوە کە ئەو پرسیار گەلانە شتی زۆری دەوروژاند و مەسیحیەکانی کردە دوو بەرە و ئەمیش کۆنگرەی نیقییەی لە ساڵی ٣٢٥ بە دوای خۆیدا هێنا کە لەو کۆنگرەدا بە تەواوەتی ئەزەلیەتی مەسیح و یەکبوونی بە باوکیەوە پێناسە کرا و بە دوای ئەمیشدا چەندین کۆبوونەوەی پەیوەندیدار گرێ درا و کێشەی کەنیسەی کاسۆلیکی درێژەی هەبوو بە تایبەت پلش ئەوەی ( کەمنۆفستیەکان ) لە رۆژهەڵاتدا سەرکەوتنیان بە دەست هێنا لە بڵاو کردنەوەی بیروڕاکانیان .

### ✓ بەشی سێیەم

بەشی سێیەمی (مێژووی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ) دا تایبەتە بە هۆزەکانی هۆن و جەرمانەکان و لە پێشەکی ئەم بابەتەدا باس لە گەلانی تیتۆنی و بنەچەیان کراوە ئەو گەلانەی کە کۆتاییان بە ئیمبراتۆریەتی رۆمانی هێنا بۆیە لە مێژوودا بە گرنگیەوە باس کراون و نەتەوەکانی ئێستای ئەوروپا ( ئیتالیا ، فەرەنسا ، ئنگلیز ..... ) لەوانن گەلانی تیتۆنی شوێنی نیشتەجێ بوونیان رون نیە چونکە راکان لەو رووە جیاوازن بەڵام زۆرێک پێیان وایە کە لە نزیک دەریای بەڵتیک ژیاون و ئەو کۆچ کردنەیان نزیکەی ١٥٠٠ ساڵی خایاندووە و بەڵام پێش تیتۆنیەکان ( کلتیەکان ) لە ئەوروپا ژیاون .

بەربەرەکان کە رۆمەکان بە تیتۆنیەکانیان بەخشیەوە بە مانای دڕندەیی دێت بەڵام لە بنەڕتدا ووشەی بەربەری لە زمانی لاتینیدا بەشێوەیەکی تر لێکدراوەتەوە " بەو خەڵکانە دەوترا کە بە زمانی یۆنانی و لاتینی قسەیان نەدەکرد " و بۆ ژمارەی هۆزە جەرمەنیەکان ئەوەیە کە هەر هۆزێکی جەرمانی نزیکەی ١٠٠ هەزار کەس دەبوون و مێژوونوسان لە سەدەی یەکەمی زاینیدا ناوی پەنجا یان حەفتا هۆزیان هێناوە ، گرنگترین هۆزەکان و شوێنی

نیشتەجێ بوونیان وەک ( ئەڵمانی – روباری راین ، بورغەندییەکان – روباری مین ، فەرەنجە دەریایەکان – راینی خواروو ، فەرەنجە سالییەکان – زەوی نەرییەکان ، ساکسۆن و ئنگلیز – نێوان روباری راین و ئەلبا ...... )

هەر لەم بەشەدا بەشێوەیەکی گشتی باس لە چەند هۆزێک دەکات وەک جەرمانی و هۆن .... و لە باسی هۆزی جەرمانی و داب و نەریتیان و پەیوەندیان بە ئیمبراتۆرەوە چەند شتێک خراوەتە روو کە هۆزی جەرمانی لە دەوروبەری ساڵی ٥٠٠ پ . ز بەرەو هەر دوو روباری راین و دانوب هاتون و ئەمەیش نزیکەی پێنج سەدەی خەیاندووە ، پۆلیۆس قەیسەر لەپاش جەنگ و داگیرکاریەکانی روبەرووی ئەم هۆزە دەبێتەوە وەسفێکیان دەکات و زانیاریەکانی بە کۆنترین زانیاری لەسەر جەرمەنیەکان دادەنرێت بەم شێوەیە ئەم هۆزە لە کێشمە کێشدا دەبن لەگەڵ ئیمبراتۆردا تا دواجار لە سنوری رۆژئاوای ئیمبراتۆردا نیشتەجێ بوون .

هۆزی هۆن و بنەچەو و جوڵانیان هەر لەم بەشەدا تیشکی خراوەتە سەر و ئەوان بە هۆزە ئاسایییەکان باس کراون و لە نێوان شاخەکانی ( تای , ئۆراڵ ) نیشتەجێ بوون و ئەمان زیاتر بە کاری شوانکاریەوە خەریکبوون و هۆزێکی لێ هاتوو بوونە و بەردەوام لە بزاوتندا بوونە و شەڕیان لەگەڵ زۆر هۆز و نەتەوەدا کردووە بۆ مانەوەی خۆیان بۆ نمونە کۆچیان کردووە بۆ سنورەکانی چین بەڵام سەرکەوتوو نەبوون بۆیە ناچار رویان لە روسیا کردووە و توشی شەڕ و شۆڕ بوونە لەگەڵ گەلانی سامارتی و غوتە رۆژهەڵاتیەکان و ئەمەیش مایەی سەرئێشە بووە بۆ ئیمبراتۆریەتی رۆمانی ، جەنگی ئەدرنە کە لە نێوان غوتە رۆژئاواییەکان و ئیمبراتۆردا روویدا لە ساڵی ٣٧٨ و تێیدا خودی ئیمباتۆر ( ڤالینت ) کوژرا ئەمەیش بە جەنگێکی گرنگ لە مێژوودا دادەنرێت کە راوبۆچونی جودای بە دوای خۆیدا هێنا . ، غوتە رۆژئاواییەکان و پەرەسەندییان بە تایبەت لەسەردەمەنی

چەند ئیمبراتۆریەکی لاوازدا زیاتر گەشەیان کرد بە تایبەت لە سەردەمی تۆریکدا دەسڵاتیان گەیشتە لۆتکە و لێرە بە دواوە غوتەکان دەسڵاتیان کەوتە لێژی تا لە ساڵی ٥١١ مەملەکەتەکەیان کەوتە دەستی موسڵمانەکان لە ئیسپانیا .
دەرکەوتنی وەندال لە ساڵی ٤٠٦ ی زاینی و چونیان بۆ ئەفریقیا و بەهێزبوونیان کە بە تەوەوەتی ئیمبراتۆریەتی رۆمانی لاواز کرد و وای کرد کە چەندین پرۆتۆکۆل واژوو بکەن بە تایبەت لە سەردەمی جۆزیفدا ، دوا بابەت لەم بەشەدا کۆتای ئیمبراتۆریەتی رۆمانیە لە رۆژئاوا بە تایبەت لە نیوەی سەدەی پێنجەمی زاین کە زۆرێک لە مەملەکەتی لە ئەوروپا و ئەفەریقای لە دەست دا بوو و لە ساڵی ٤٧٦ سەرکردەی جەرمەنی ( تۆدراکۆ) توانی ئیمبراتۆری ئەو دەمە لا بدات و ئەمەیش بوو بە کۆتای ئیمبراتۆریەتی رۆم لە رۆژئاوا .

### ✓ بەشی چوارەم

بەشی چوارەمی کتێبەکە تەرخان کراوە بۆ هۆزە گرنگەکانی جەرمانی ( غۆت و لۆمبارد ) و لە سەرەتای ئەم بەشەدا تیشک خراوەتە سەر مەمالیکە جەرمانیەکان دوای ساڵی ٤٧٦ ز جگە لە ئۆدراکۆ پێنج مەمالیکی گەورە لە ئەوروپا هەبون کە هەریەکەیان جێگەیەکی لە ژێر دەست بوو ، دوا بە دوای ئەو مێژووەی سەرەوە غوتە رۆژهەڵاتیەکان دەر دەکەون پاش ئەوەی لە هێرشێکدا تیۆدرۆکی ئیمبراتۆر بە دیل دەگرن و پاشان فراونخوازیان دەست پێ دەکات بە شێوەیەکی هەڵکشان و داکشان ئەمەیش وا دەکات کە تیۆدرۆک جارێکی تر بێتەوە مەیدان و بۆ ماوەیک دادپەروەری و ئارامی باڵی بەسەر مەملەکەتدا کێشا یە جۆرێک راقینای کردە پایتەخت و لە پاش نەمانی لە ساڵی ٥٢٦ مەملەکەتەکەی بە تەوەتی تێک دەچێت .

بۆرغەندیەکان کە هۆزێکی لاوازی مەمەلەکەتی جەرمانی بون لەو مێژووەدا ناویان هاتووە کە هەندێک جیاواز بوون بە تایبەت لەوەی کە زمانی لاتینیان لە بری زمانی جەرمانی بەکار دەهێنا لە کاروباری دەوڵەتدا و ( کۆندربار ) یەکێکە لە پاشا بە ناوبانگەکانیان و بە دوای ئەمانیشدا فەرەنجیەکان دێن ، فەرەنجەکان فەزڵی زۆریان بەسەر ئەورپاوە هەیە بەشێوەیەک تا ساڵانی نۆسەدەکان بە دواوە لە فەرەنسا و ئەڵمانیا بمێننەوە و ئەمانیش دوو بەشن فەرەنجە ( سالیەکان ، دەشتەکییەکان ) و ئەمان هەرچەندە هەوڵی فراونخوازیان دا بەڵام جێگەی رەسەنی خۆیان کە روباری راینە پاراست .

کلۆفس مەزنترین کەسایەتی بوو کە لە رۆژئاوای ئەوروپا لە ماوەی نێوان ( پۆلیس قەیسەر ، شارلمان ) دا دەرکەوت و لە لەناو بردنی رۆمانیەکان لە غالدا دەستی بەکار کردن کرد و پاش ئەوەی فەرەنجە دەشتەکییەکان داویان لێ کرد بە هانایەنەوە بچن لە دژی ئەڵمانیەکان و ئەویش توانی بەسەریاندا زاڵ بێت و توانی مەملەکەتی فەرەنجی میرۆفنجی دابمەزرێنێت ، کلۆفس پاش هێنانی ( کلوتید ) بوو بە کاسۆلیکی هەرچەندە پێشتر لەسەر بیروباوەڕی بت پەرست بوو ئەمەیش بە وەرچەرخانێکی گرنگ بۆ مێژووی مەسیحیەت دادەنرێت ، لە پاش مردنی کلۆفس دەسڵات پشتاو پشت رۆشت تا مەملەکەت بۆ سێ قەوارەی سیاسی و کۆمەڵایەتی دابەش بوو ( ئۆستراسیا ، نەستریا ، بۆرغەندیا ) هاتنی جنسستیان و هەوڵدان بۆ گەڕاندنەوەی دەسڵات بۆ ئیتالیا کە چەندین جەنگی بەرپا کرد بەوە گەیشت کە زۆربەی هەرێمە رۆژئاوایەکانی بۆ ئیمبراتۆر گەڕاندەوە و لە پاش نەمانی مەترسی لۆمباردییەکان سەری هەڵدایەوە کە ئەمان دواین گەلانی جەرمەنی بوون کە چونە ناو سنورەکانی ئیمبراتۆرەوە و لەسەر بیروباوەڕی ئارسیۆی بوون دواتر بون بە کاسۆلیک .

لە دوابەشی ئەم بابەتدا باس لە چەندین ئاکار وکردار و یاسا و ژیانی ئاسای جەرمانەکان و پەیوەنیدیان بە رۆماوە دەکات کە دەکرێت وەک سەر

ئەنجامێک چاوی لێ بکرێت یان وەک پوختەیەک تێی بڕوانی بە تایبەت لە رووی هەڵسوکەوت و ژیانی رۆژانەوە .

### ✓ بەشی پێنجەم

بەشی پێنجەم تایبەت بە پاپەرییەت و کەنیسە و گەشەکردنی کەنیسە و پاپاکان و لە بەرای ئەم بەشەدا باسێکی کورت لە کەنیسە و ئەوانەی لە کەنیسەدا کار دەکەن کراوە ، دوانزە حەوارییەکان بنەڕەتی ئەکلیس بوون و ئەکلیرس پیاوی یەکەمی کەنیسە بوون و هەریەکە لە ( قەدیس پترۆس ، قەدیس پۆڵس ) بە یەکەمین کەسانێ دادەنرێن لە رۆمادا کەنیسەیان دروست کردووە و پاپەریەت و سەردەمە بەرایەکانی کە بە سەردەمی چەوساندنەوە ناو زەند کراوە تیشک خراوەتە سەر ی ، باس لەسەرەتای مەسیحیەت و پێگەی گەورەی ئەسقفی رۆما کە دیار کەوت لە سەدەی سێیەمدا لە باکوری ئەفریقا کۆمەڵێک لە ئەسقفەکان تەحەدای دەسلاتی ئەسقفی رۆمایان کرد بەڵام ئەسقفی قرتاجە لە ساڵی ٢٥٨ ز بڕیارێکی دا بۆ یەکبوونی کەنیسەکان و بە پێویستی زانی کەنیسە دەبێت کاسۆلیکی بێت .

پاپەوییەت لە هەردوو سەدەی چوارم و پێنجەمدا زۆر بەرەو پێشەوە چوو و هەر لەو دەمەدا نازناوی پاپا درا بە ئەسقفی رۆما و دەسلاتی پاپا لەم دەمەدا زۆر بەرەو پێشەوە چوو و لەم ماوەیەدا چەندین کۆبوونەوەی ئاینی گرێ درا و یاسا و فەرمانەکانی پاپا بوون بە سەرچاوەی گرنگ بۆ بەڕێوەبردنی کەنیسە .

شاری قوستەنتینیە و پەیوەندی بە ئاینی مەسیحیەوە وگرنگی ئەم شارە بۆ ئەو ئاینە باسێکی گرنگی مێژوویە بە تایبەت لە ئاینی مەسیحیدا بە بەرەی رۆژهەلات و رۆژئاوا دادەنرێت و کۆبوونەوەی ئاینی قوستەنتینیە لە ساڵی ٣٨١ ئەم شارەی کردە پلە دوو دوای رۆما و دوا بەدوای ئەم مێژووە ووردە ووردە ئەو شارە گرنگی خۆی پەیدا کرد بە جۆرێک دەستی خۆی بەسەر

هەموو کەنیسەکانی رۆژهەڵاتدا سەپاند و لەسەرەتای سەدەی هەشتەمدا ناکۆکی نێوان رۆما و قوستەنتینیە گەیشتە ئاستێکی مەترسیدار و هاتنی ئاینی ئیسلامیش کاریگەری لەو نێوەندەدا هەبوو و هاوکات جیابوونەوەی سیاسی لەنێوان هەرێمە رۆژهەڵاتی و رۆژئاوایەکانی ئیمبراتۆردا سەری کێشا بۆ جۆرێک لە جیابوونەوەی ئاینی و لەودەمەدا رۆژهەڵاتیەکان لە رووی ئابوری و رۆشنبیریەوە لە پێشەوەی ئەوانی ترەوە بوون سەرەڕای نارەزای بەردەوامی پاپا بەڵام پاتریارکی قوستەتینیە نازناوی پاتریارکی گشتی بۆ خۆی بەکار هێنا و لە نێوان سالآنی ( ٦٥٠ – ٧٥٠ ) ز شەش پاپا دروست بوون کە هەمویان رۆژهەڵاتی بوون .

پاش ئەوەی کەنیسە گەشەی کرد زیاتر گرنگی دەرکەوت و ئەرکی زۆری کەوتەسەر شان بە جۆرێک لە سەدەی پێنجەمدا ئیمبراتۆر توشی قەیران بوو کەنیسە توانی چەندین خزمەتگوزاری پێشکەش بکات وەک دروست کردنی نەخۆشخانە و لە بواری ئاینیشدا کەنیسە زباتر دەستی کرد بە رێنما و باس کردن لە دنیای تر هەموو ئەمانەیش وای کرد کە کەنیسە بایەخ و رۆڵی زۆری لە ژیانی هاوڵاتیاندا هەبێت ، دوا بابەت کە لەم بەشەدا باس کراوە تیشک خراوەتە سەر چەند پاپایەک لە سەدەکانی ناوەڕستدا وەک :

١ – پاپا لیوی یەکەمی مەزن
٢ – پاپا گلاسیۆسی یەکەم
٣ – پاپا گریگۆری مەزن .

## ✓ بەشی شەشەم

بەشی شەشەم کە تایبەتە بە میرۆفنجییەکان و کارۆلینجییەکان تیشک خراوەتە سەر چەند بابەتێکی پەیوەندیدار و لەسەرەتادا باس لە میرۆفنجییەکان و ململانیەکانیان دەکات بۆ دەسڵات و لەم سەردەمەدا رۆڵی ژنانی پاشادا دەر دەکەوێت کە چۆن لە هەوڵی هێشتنەوەی دەسڵاتدان بۆ

مێرد و کوڕەکانیاندا و هاوکات دەرکەوتنی وەجاغزادە ئاینی و عەلمانیەکان دەردەکەوێت ، داگۆبەرت دواین پاشای میرۆفنجییەکان بوو کە لە ساڵی ٦٣٩ کۆتای بە دەسڵاتی هات و دەسڵاتی ئەو پادشاییەتیە بە تەواوەتی لاواز بوو .

کارۆلنجی و هاتنە سەر تەختەی مێژوو هەر لەم بەشەدا باس کراوە و پیپێن بە یەکەم کەس لەوان دادەنرێت کە سەرۆکایەتی کۆشکی کردووە بەڵام هەوڵەکانی بۆ مانەوەی زۆر دریِّژەی نەکێشا و بە دوای ئەمدا پیپسینی دووەم دێت کە هەوڵەکانی بۆ پێک هێنانی ئیمبراتۆریەتێکی یەکگرتوو بوو بە جۆرێک توانی رێگری لەسەربەخۆی ئەڵمان و باڤاری و ئۆکتینەکان بگرێت ، شارل مارتل کە بە کوڕە ناشەرعیەکەی پیپین ناسراو بوو توانی دوای باوکی دەسڵاتێکی بەهێز بێنێتە کایەوە بە جۆرێک کە کاریگەری ناوخۆی و دەرەکی هەبوو لە دەرەوە توانی لە جەنگی ( بوا ) بەسەر موسڵمانەکاندا سەرکەوێت و لە ناوخۆیشدا توانی هەموو دەسڵاتە لۆکاڵیەکان لە ناو بەرێت و دوای مردنی ئیمبراتۆرێتێکی بەهێزی بەجێ هێشت .

پاش مردنی مارتل پیپینی کورتە باڵا هاتە سەر تەخت و توانی پەیوەندیەکی باش لەگەڵ کەنیسەدا دروست بکات و ئەو بە یەکەمین پاشا دادەنرێت کە لە لایەن پاپاوە کراوە بە پاشا و توانی خزمەتی زۆر بە کەنیسە بکات لە پێناو مانەوەی دەسڵاتی خۆیدا و تا کاتی کۆچ کردنی ٧٧١ لە دەسڵاتدا مایەوە و دوای ئەمیش وولات کەوتە دەستی شارلمان کە نزیکەی نیو سەدە لە دەسڵاتدا مایەوە ، هاتنی شارلمان بۆ ئەوروپا زۆر گرنگ بوو بە تایبەت کاتێک ویستی سیاسەتی فەرەنج لە گرتنە دەستی دەسڵاتدا پەیڕەو بکات لە تواندنەوەی هەموو نەتەوە جیاوازەکان لە ناو یەک قەوارەدا .

سەردەمی شارلمان بە تۆماری جەنگ دادەنرێت چونکە لە ماوەی حوکم کردنیدا لە جەنگێکی بەردەوامدا بوو بە جۆرێک کە دەوترێت ٥٤ جەنگی

بەرپا کردووە چ لە ناوخۆی وولات چ لە دەرەوەی دەسەڵاتیدا و زۆر ترین جەنگی دژی سەکسۆنەکان بووە کە بریتیە لە ١٨ جەنگ کە بە خوێناوی ترین جەنگی دادەنرێن و رەنگە هۆکارێکی ئەم جەنگانەی شارلمان بۆ ئەوە بێت کە سەکسۆنیەکان بت پەرست بوون و نێوانی فەرەنج و ساکسۆنی زۆر خراپ بوو بە جۆرێک لە یەک رۆژ و لە یەک جەنگدا ٤٥٠٠ ساکسۆنی بە دەستی فەرەنجەکان کوژراوە لە جەنگی فەردان لە ساڵی ٧٨٣ و ئەمیش بوو بە هۆی مل کەچ بونیان بۆ ئاینی مەسیحی ، بە هۆی بە هێز بوونی شارلمان پاپا تاجی لەسەر نا و نازناوی ئیمبراتۆری لێنا کە ئەمە لە مێژوودا کەم وێنە بوو بە جۆرێک هەموان ئەویان بە ئیمبراتۆر دەزانی و تەنانەت ئیمبراتۆر ( میخایلی یەکەم ) ی قوستنتینی یەکەم دانی نا بە ئیمبراتۆری شارلماندا و زۆرێک لە کاروبارە ئیداری و سیاسیەکان لەسەردەمی ئەمدا گەشایەوە و لە رووی ئیداریەوە ( کۆنتێ ) هەبوو کە یەکەیەکی ئیداری سەرەکی بوو کە کاروبارەکانی بەڕێوە دەبرد و دادگاکان زۆر تر بۆ تاوانە قورسەکان دادەنیشتن دەتوانین بڵێین شارلمان پاشایەکی تا رادەیەک دڵسۆز و ئیداری بوو توانی خزمەت بە هەموان بکات و خۆی بە ئیمبراتۆردا بگەڕێت .

پاش مردنی شارلمان لویسی لە خوا ترسی کوڕی لە ساڵی ٨١٤ هاتە سەر تەخت کە پیاوێکی ئاینی لە خوا ترس بوو ئەمەیش وای کرد کە ئیمبراتۆرێتەکەی پەرت پەرت بێت و خەڵک یاخی بن و وەرەسەی دەسلات یەکێک بوو لە گرفتەکانی سەردەمی ئەم و پاش مردنی ئیمبراتۆر دابەش بوو بە پێی پەیمانی فەردان لە ساڵی ٨٤٢ ز ، بە پێی پەیمانی فەردان ئیمبراتۆریەتی کارۆلینجی لە نێوان هەر سێ کوڕەکەی لویسی لە خوا ترسدا دابەش بوو ئەمەیش بە پەیماننامەیەکی گرنگ بۆ ئەوروپا دادەنرێت چونکە نەخشەی بۆ زۆرێک لە وولاتانی ئەوروپا کێشا .

دوای پـەیمـانی فـەردان ئیمبراتـۆر بـە تـەواوەتـی تێـک چـوو و بـێ هێـزی ئیمبراتۆر بوو بە بەهێزی پاپا و ئەمیش وای کرد کە بۆ ماوەیەک کەنیسە بە هێز بێت تا دەهات پشێوی درێژەی دەکێشا کە چەنـدین هۆکـاری نـاوخۆی و دەرەکی بوون بە هۆی روخانی ئیمبراتۆریەتـی کـارۆلینجی ، پـسپۆڕی بـواری مێـژوو ( هنـری پـرین ) پێـی وایـە ئـەم هـەرەس هێنانـە بـۆ فـشۆڵی ئـەو ئیمبراتۆریەتە دەگەڕێتـەوە کـە لـەسـەردەمـی شـارلماندا دروسـت کـرا و ئـەو هۆکاری ناوخۆی بە گرفتی یەکەم دادەنێت و هاوکات هۆکارە دەرەکیەکـانیش کاریگەریان هەبووە بە جۆرێک دوو سەد ساڵی دوای شارلمان بـە سـەردەمـی تاریکی دادەنرێت بۆ ئەوروپا ئەمە جگـە لـە هێرشـی دەرەکـی وەک سـلاڤ و هەنگاری و بولگاریـەکـان لـە رۆژهـەڵاتـەوە و عـەرەبکـان لـە باشـورەوە و لـە رۆژئاواو و باکوریشەوە ڤاکینیەکان لە هێرشی بەردەوامدا بوون .

### ✓ بەشی حەوتەم

بەشی حەوتەم تایبەت کراوە بۆ گەشەکردنی وڵاتە سەرەکیـەکـانی ئـەوروپـا لەنێوان سەدەی ( ١١- ١٥ ) دا و لە بەرای ئەم بـەشـەدا بـاس لـە ئنگلتـەرە دەکات پێش فەتحی نۆرمانـدی وەک سـەردێکـی مێـژووی بـۆ ئـەو وڵاتـە بـە جۆرێک باس لە ریشەو نەژادی ئنگلتەریەکان دەکات کە لە سەدەی یەکـەمـی پـێش زایـن نـەتـەوەیـەک نیـشتەجێـی ئنگاتـەرە بـوون پێیـان دەوتـرا ( کلتییەکان ) کە بڕوایە وایە لە حەوزی دەریای سپی ناوەڕاستەوە هـاتبن و پێش ئەمانیش ( ئیبیرییەکان ) لەوێدا ژیاون و لە پاش سەدەی یەکـەمـی پێش زاین داگیرکاری و ململانیە لەو وڵاتەدا دەست پێ دەکات و تا سەدەی پێنجەم رۆمانیەکان توانیان دەست بەسـەر ئـەم وڵاتـەدا بگـرن و دوابـەدوای ئەمانیش هۆزە جەرمانیەکان هێرشـیان کـردە سـەر ئنگلتـەرا و لـەو دەمـەدا پـشێوی بـاڵی بـەسـەر وڵاتـدا کێـشابوو وە لـە کۆتـای سـەدەی شـەشـەمـدا ( قەدیس ئۆگـەسـتین ) ئـاینی مـەسـیحی لـە دورگـەکـانی ئـەو وڵاتـەدا بـڵاو

کردەوە ، لە سەدەی ( ٧ — ٩ ) ناکۆکی لە نێوان مەمالیکە جەرمانیەکاندا بەردەوام بوو کە حەوت دانە بوون و لە ماوەی سەدەی ( ٩ و ١٠ ) دا ئنگلتەرا روبەرووی هێرشی ڤایکنکەکان بووەوە بەم جۆرە ململانیەکان بەردەوام بوو تا جەنگی هاستنجەز کە بە جەنگی یەکلاکەرەوە دادەنرێت چونکە کۆتای بە کۆشەگیری ئنگلتەرا هێنا و ئەو وولاتە بوو بە خاوەنی دەسلاتێکی بەهێز .

بە هاتنی نۆرماندیەکان و ولیەمی فاتح بە تایبەت گۆڕانکاری لە سیستەمی ولات روویدا و ئەو کەسایەتیە بە گرنگیەوە لێی دەڕوانرێت لە چەرخەکانی ناوەڕستدا و گەلێک کاری گرنگی کرد لەوانە ( هەموو قەلاکانی ولاتی خستە ژێر دەسلاتی خۆی ، جەنگی وەجاغزادەکانی لە دژی یەکتر قەدەغە کرد ، پەیڕەوکردنی سیستەمی دەرەبەگایەتی ..... ) و لە بواری ئاینیشدا کاری زۆری کرد کە دادگای ئاینیەکانی لە دونیایەکان جیا کردەوە و لە بواریی ئابوریشدا چاکسازی زۆری کرد و گەلێک بنەمای دانا بەم جۆرە توانی ئنگلتەرا ببوژێنێتەوە بەلام پاش کۆچی دوای لە ١٠٨٧ هنری یەکەمی کوڕە بچوکەکەی هاتە سەر حوکم ئەمیش پاش کوشتنی براکەی ( رۆبەرت ) .

لە سەردەمی شا هنری یەکەمدا کە نزیکەی ٢٥ ساڵ حوکمڕانی کرد هەردوو سیستەمی کارگێڕی و دارایی هەنگاوی گەورەیان بڕی و دادگای پاشایەتی زۆر تر رۆڵی هەبوو تا دادگای دەرەبەگایەتی و هەروەها یاسا گشتیەکان لە سەردەمی ئەمدا زۆر گرنگی پێ دەدرا و سێکتەری دادپەروەری و ئاسایشش گرنگی زۆری پێ دەدرا تا وای لێ هات نازناوی (شێری دادپەروەر ) پێ بەخشرا بەلام پاش کۆچی دوای هنری یەکەم سەرگەردانی وولاتەی گرتەوە تا ئەودەمەی هنری دووەم لە ساڵی ١١٥٤ هاتە سەر حوکم تا ساڵی ١١٨٩ ی زاینی لە حوکمدا مایەوە کە بە یەکێک لە پاشا مەزنەکان دادەنرێت و لەسەردەمی خۆیدا دادگا و دەزگا کارگێڕیەکانی بەهێز کرد و سوێند خواردن لە دەدگادا لەسەردەمی ئەمدا کارێکی باو بوو دواتر کاری پێ کراوە

و رەنگە ئەم نەریتەیش بۆ سەردەمی رۆمانیەکان بگەڕێتەوە ، سوربوونی هنری دووەم بۆ بەهێزبوونی دادگاکان سەری کێشا بۆ دروست بوونی ناکۆکیەکی مەترسی دار لە نێوانی کەنیسەدا و ئەمەیش دوو جۆر دادگای دروست کرد کە دادگای ( پاشایەتی ، ئاینی ) بوو و بەم جۆرە حوکم رانی بەردەوام بوو تا کوشتنی ( بیکیت ) و دوای کوشتنی ئەو کەسایەتیە توشی لێپێچینەوە بوو و تەمەنە کۆتاییەکانی بە باشی بەسەر نەبرد و نێوانی لەگەڵ کەسە نزیکەکانی خۆیشیدا خراپ بوو .

ئنگلتەرا لە سەدەی سیازدەهەمدا لەسەرەتاوە توشی گرفتی پاشایان و بارۆنەکان بووە بە تایبەت دوای ئەوەی توشی قەیرانی دارایی و ئابوری بوونەوە و ئەمەیش سەری کێشا بۆ ململانیە لە نێوان جۆنی یەکەم و بارۆنەکاندا یە جۆرێک درێژەی کێشا و جۆنی یەکەم بێ هێز و لاواز بوو وەتێوە کلاببوو بە گەندەڵی و لە ململانیەدا بوو لەگەڵ هەریەکە لە ( ئۆغستس ) ی فەرەنسی و ( پاپا ئۆنۆسنتی سێیەم ) و جۆنی یەکەم هێرشی بردە سەر ئۆغستس و لەگەڵیدا تێک شکا و لەگەڵ پاپایشدا کەوتە رێکەوتن و زۆر ملکەچی بۆ نواند و لەسەردەمی ئەمدا پەیماننامەی مەزن ( ماگناکارتا ) لە ساڵی ١٢١٥ هاتە گۆڕێ کە ناچار بوو ئیمزای بکات کە ئەو پەیماننامەیە خۆی لە ٦٣ خاڵدا دەبینێتەوە کە زیاتر ئیمتیازاتی دەرەبەگ و وەجاغزادەکانە و کەمتریش باسی دەسڵاتی ئاینی و بازرگانی دەکات ئەم پەیماننامەیە گرنگی خۆی هەیە لە مێژوودا و پاشاکانی بەریتانیا پشتگیری ماگناکارتایان دەکرد و لە سەدەکانی دوانزەدا بوو بە بەڵگە و نامەیەکی سەرەکی بۆ دەستوری ئنگلیزی .

لەسەردەمی هنری سێیەمدا ململانیەکان بەردەوام بوو هەر چەندە زۆر پابەندبوو بە پەیماننامەی مەزنەوە بەڵام پاش پێک هێنانی ژیانی هاوسەرگیری لەگەڵ شازادەیەکی فەرەنسی و گرنگی پێ دانی زۆری بە خانەوادەکەی وای کرد بارۆنەکان توڕە بن و لە دژی بوەستنەوە و ئەمەیش

وای کرد کە ( مەرجننامەی ئۆکسفۆرد ) قبـولّ بکـات ، لـە پـاش دەسـلاّتی ئەدواردی یەکەم لە سالّی ١٢٧٣ هاتە سەر عـەرشـی دەسـلاّت و یـەکێـک لـە تایبەتمـەندیـەکـانی ئـەم دروسـت بـوونی پـەرلـەمانـە ، لـە مـاوەی دەسـلاّتی ئەدواردا پەرلەمانێکی نمونەی پێک هێنرا هەر چەندە ئـەم وولاّتـە بـە چـەنـد قۆناغێکدا تێپەڕیەوە لە رووی ئەم جۆرە ئەنجومـەنانـەوە لـە رووی واتایـەوە پەرلەمان چەن واتایەکی داوە وەک ( کۆبوونەوە ، کۆبوونەوەی ئەنجومـەنـی پاشا ، پەرلەمانی نمونەی ) .

تایبەتمەندی مێژووی بەریتانیا لە هەروو سـەدەی ( ١٤ و ١٥ ) دا تێکچـونی دەزگاکانی دەرەبەگایەتی و گەشەکردنی پەرلەمان و بازرگانی و پیشەسازییە و هاوکات بلاّوبونەوەی نـەخۆشـی تـاعون کاریگـەری کۆمـەلاّیـەتـی و ئـابوری خراپی لەسەر ژیانی خەلّک بەجێ هێشت سەرەڕای کاریگەریـەکـانی جـەنگـی سەد سالّە ، لە سەردەمی ئەدواردی سێیەمدا پەرلەمان سەرکەوتنـی زیـاتری بە دەست هێنا و بە پیاوێکی لێ هاتوو دادەنرێت لـە ئاسـتی نـاوخۆی تـوانی رێگری لە سەربەخۆی ( سکوتلاند ، وێلّز ) بکات و لـە ئاسـتی دەرەوەیـشدا توانی جەنگی سەد سالّە لەگەلّ فەرەنـسا بـەرپـا بکـات ( ١٣٣٧ – ١٤٥٣ ) کە بە سەرکەوتنی ئنگلتەرا کۆتای پێ هـات هاوکـات لـەسـەردەمـی ئیـدواردا پـەرلـەمـان بـوو بـە دوو بـەشـەوە ( یـان بلّێـین بـوو بـە دوو ئـەنجومـەنـەوە ( ئەنجومەنی لۆردات ، ئەنجومەنـی گشتی ) و پـەرلـەمـانی ئنگلیـزی تـوانی دەسلاّتی دارای لە دەستی پاشا وورده ورده دەر بکـات و بتـوانن رۆلّیـان لـە دانانی پاشادا هەبێت وەک ئەوەی کە هنری چوارەمیـان هـەلّبـژارد لـە سـالّی ١٣٩٩ زاینی و چوە سەر کورسی دەسلاّت و ئەمەیش بـۆ کـاری پـەرلـەمـانی زۆر گرنگ بوو .

بەریتانیا لەسەردەمی هنری چوارەم و پێنجەم و شەشـەمـدا لـە سـالّی ١٣٩٩ – ١٤٦١ دەسلاّتی پەرلەمان زۆر فراوان بوو وە لەسەردەمی هنری پێنجەمدا پاش جەنگی ئەجینکۆرت لە سالّی ١٤٢٠ توانی بەسەر فەرەنـسیەکانـدا سـەر

بکەوێت بەڵام بە مردنی ئەم پاشایە ئەم بنەماڵەیە توشی شکست هاتن پاش ئەوەی هنری شەشەمی کوڕ هات بە هاتنی ئەم کە تەمەنی هێشتا نۆ مانگی تەواو نەکردبوو ناچار وە×ی بۆ دانرا و پاش ئەوەی کە تەمەنی بوو بە ١٨ ساڵ هاتە سەر حوکم بەڵام سەرکەوتوو نەبوو بە جۆرێک کە توشی نەخۆشی دەرونی بوو وە ریچاردی دۆقی ( یۆرک ) کرا بە وە×ی بەسەریەوە و زۆری نەخایاند ریچارد جەنگی لە دژ بەرپا کرد و ئەم جەنگەی نێوان بنەماڵەی یۆرک و لانکسەر بە جەنگی گۆڵ ناسراوە کە جەنگێکی خوێناوی بوو وە بە هاتنە سەر تەختی یۆرکەکان کۆتای هات کە نزیکەی بیست و چوار ساڵ لە حوکمدا مانەوە ،ئەدواردی چوارەم ١٤٦١ – ١٤٨٥ یەکەمین پاشای بنەماڵەی یۆرک بوو ئەو کەسێکی خۆشەویست و زیرەک بوو وە وولآت لە سایەی ئەمدا ئارامی بەخۆیەوە بینی و پاش مردنی کوڕە دوانزە ساڵانەکەی ( ئەدواردی پێنجەم ) بوو بە پاشا و ریچاردی برای بوو بە وەصی بەسەریەوە و دوای ئەمەیش نا ئارامی وولآتی گرتەوە کە بە هاتنە سەر تەختی ( هنری حەوتەم ) لە بنەماڵەی لانکستەر پاش جەنگ لەگەڵ یۆرگەکان کۆتای هات .

هەر لەم بەشەدا باس لە فەرەنسا دەکات بە تایبەت دوای پەیمانی فەردان و دەرکەوتنی بنەماڵەی کابێ و دەرهاویشەتەکانی ئەو دەمە و گەشەکردنی ئەو وولآتە ، یەکێک لە ئامانجە گرنگەکانی پەیمانی فەردان سەرهەڵدانی دوو دەوڵەتی نوێ و گرنگ بوو ( فەرەنجی رۆژئاوا ، فەرەنجی رۆژهەلآت ) بنەماڵەی کابێ نزیکەی یەک سەدە لە کێبەڕکێدا بوون لەگەڵ فەرەنجیەکاندا و سەر ئەنجام لە ساڵی ٩٨٧ یەکێک لە نەوەکانی کابێ ( هێو کابێ ) توانی دەسلآت لە فەرەنسا بگرێتە دەست و ئەو دەمە ئەو وولآتە لە چەند دوورگەیەک پێک هاتبوو کە میرە دەرەبەگەکان حوکمیان دەکردن و دەسلآتێکی سەربەخۆیان هەبوو دەوترێت فەرەنسا لە سەدەکانی ( ٩ – ١١ ) لە میرنشینێکی دەرەبەگایەتی زیاتر هیچی تر نەبوو بەڵام چەند

هۆکارێک بوو بە هۆی ئەوەی کە لە دەسڵاتدا بمێننەوە وەک ( ناکۆکی بەردەوامی میرەکانی چوار دەوری فەرەنسا ، مانەوەی باوک لە دەسڵاتدا و دانانی کوڕە گەورەکەی لە دەسڵاتدا ، گرنگی سەر زەمینی ( دورگەی فەرەنسی ) ....

لە سەدەی ١٢ دا چەند گۆڕانێکی ناوخۆی و دەرەکی رویدا کە بوون بە هۆی پتەوکردنی دەسڵاتێکی پاشایەتی و بەهێز کردنی حوکمەتی ناوەند ، گۆڕانکاریە ناوخۆیەکان گەلێک بوون لەسەر دەستی بنەماڵەی کابێ بوو ئەوان توانیان هەرچی وەجاخزادە و دەرەبەگە بیخەنە ژێر دەسڵاتی خۆیان بە تایبەت لویسی شەشەم و بە دوای ئەمیشدا پاشاکانی تر دەستیان کرد بە چاکسازی ئابوری و کۆمەڵایەتی و لە باکوری وڵاتدا شارەکان گەشەیان کرد و چینی بورژواکان دروست بوو و هاوکات ئاڵوگۆڕ بە پارە دەکرا و برەوی پەیدا کرد و لە دوای ساڵی ١١٧٣ ئەنجومەنی پیاوانی دنیای و ئاینی پێک هات و دواتر ئەمە گۆڕانی بەسەردا هاتوو بوو بە ئەنجومەنی ( پاشا ، پەرلەمان ) .

جگە لە گۆڕانکارییە ناوخۆیەکان چەند گۆڕانێکی دەرەکیش رویدا وەک هەوڵدان بۆ فراوانخوازی دەسڵات بەتایبەت زیاد کردنی هێزی پاشایەتی نۆرماندی لە بەریتانیا .

قلیبی دووەم ١١٨٠ – ١٢٢٣ ی زاینی بە بە تواناترین پاشای فەرەنسا دادەنرێت لە سەدەکانی ناوەڕستدا و بە فلیپ ئۆغستس ناسراوە و لەم بەشەدا تیشک خراوەتە سەر ژیانی و هەوڵەکانی بۆ بەهێز کردنی دەسڵاتی و لە جەنگدا بوو بۆ پاراستنی دەسڵاتی خۆی بە شێوەیەک ناکۆکی نێوان خۆی جۆن درێژەی کێشا بەڵام فلیپ لەم جەنگەدا سەرکەوتوو بوو کە لە مێژوودا بە جەنگی بۆفین ناسراوە ، ئەم جەنگە بۆ فەرەنسا زۆر گرنگ بوو بە شێوەیەک کە مەترسی ئنگلیزی لەسەر ئەو وڵاتە نەهێشت و بووە مایەی سەروەری لە دەستی ئەو وڵاتە و رۆمای پیرۆز .

فلیپ لویسی هەشتەمی کوڕی لە جەنگی خاچ پەرستەکاندا بەشدار بوون و جەنگەکە بە لەناوبردنی بیدعەی ئەلبەجنسی و سەربەخۆی ئۆلۆز کۆتای هات .

لویسی نۆیەم کە لە ١٢٢٦ — ١٢٧٠ لە حوکمدا بوو کە بە ( قەدیس لویس ) یش ناسراوە پاشایەتی لە فەرەنسا گەیشەتە ئەوپەڕی هێزی دەسڵاتی خۆی هەر چەندە تەمەنی منداڵ بوو کە کرایە پاشا بۆیە دایکی ( پلانش ) کرایە وە×ی و زۆر هاوکاری کرد ، ئەم پاشایە نمونەی پاشایەکی دادپەروەر و سوار چاک و لە خوا ترس بوو ئەمەیش وای کرد کە ڕێزی زۆری لێ بگیرێت و چاکی ئەم هاوتا بوو لەگەاَ لویسی چواردە بۆ بەراورد کردن و نمونەیەکی چاک بوو بۆ مەسیحیەت و زۆر گرنگی بە چاودێری پشکنین دەدا جەنگە خێڵەکیەکانی لە سەرانسەری وڵاتدا قەدەغە کرد و دادگا ساختەکانی ڕاوەستاند و دارایی ڕێکخستەوە و کاروباری باج و خەراجی جارێکی تر داڕشتەوە .

بۆ یەکەمین جار بوو خەڵکی ئەو ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕستدا هەستیان کرد کە حوکمەتیان هەیە و دەزگایەک نیە بیانچەوسێنێتەوە و لەسەر ئاستی دەرەوەیش گرنگترین کار ڕێکەوتنامەی پاریس بوو لەگەڵ هنری سێیەمی پاشای بەریتانیا لەساڵی ١٢٢٩ و بە پێی ئەو ڕێکەوتنامەیە هنری لەبەرامبەر هەندێک هەرێم وازی لە مافە میراتیەکانی لە نۆرماندیا و بۆتزا و میندا هێنا .

هەر چەندە ڕاوێژکارەکانی لویس هەوڵیان دا بەشداری لە جەنگی خاچ پەرستەکاندا بکات بەڵام ئەو دوو هێرشی ڕێکخست لە ساڵانی ١٢٤٨ و ١٢٧٠ بەڵام تێیدا سەرنەکەوت و بە مردنی پرۆژەکانی بۆ جەنگی خاچ پەرستەکان شکستی هێنا بە تایبەت پێش ئەوەی بگاتە تونس و داگیری بکات کۆچی دوای کرد ، تا مردنی لویسی نۆیەم سیاسەتی پاشایەتی فەرەنسا خۆی دەبینیەوە لە یەکێتی فەرەنسا و بە هێز کردنی دەسڵاتی ناوەند و ڕێگری لە

فراوانخوازی پاشایانی بەریتانیا و ئەمەیش درێژەی کێشا بە جۆرێک کە فراوانخوازی ئەو وولاتە دەستی پێ کرد بۆ دەرەوەی خۆی و ئەمیش توشی تێوەگلانی کرد بە چەندین ئاریشە ، لە سەدەی سیازدەمدا فەرەنسا بوو بە هێز ترین وولاتی ئەوروپا و لە رووی سیاسی و و ئابوری و ئیداریەوە گەشەکردنی بە خۆیەوە بینی .

لە پاش کۆچی دوای فلیپی سێ یەم فلیپی چوارەمی کوڕی هاتە سەر حوکم و بە هاتنی ئەم پاشایە بنەماڵەی کابێ لە نەمان نزیک دەبونەوە پاش ئەوەی هەر سێ کوڕەکەی دەسلاتیان گرتە دەست لە ساڵی ١٣١٤ — ١٣٢٨ و پاش ئەوان هیچ کامیان کوڕیان نەبوو و پاش مردنی شارلی چوارەم بنەماڵەی کابێ پاش ئەوەی چوار سەدە لە دەسلاتدا بوون کۆتای هات و فیلیپ دی فالوا بە ناوی فیلیپی شەشەم دەسلاتی گرتە دەست .

**جەنگی سەد ساڵە کە لە ساڵی ١٣٣٧ — ١٤٥٣ ی خایاند بۆ هەریەکە لە فەرەنسا و ئنگلیز گرنگ بوو ئەمیش بوو بە مایەی چەندین جەنگ و دەسکەوت بۆ هەر یەکەیان و گرنگترین هۆکاری هەڵگیرسانی ئەم جەنگە بریتیە لە :**

١ — مەسەلەی سکوتلاند لە مەترسی دارترین ئەو کێشانە بوو کە بەریتانیا پێوەی دەنالاند .

٢ — مومتەلەکاتی پاشایەتی بەریتانیا بوو لە فەرەنسا .

٣ — کێشەی فلاندرز کە زۆر لە کێشەی سکوتلاند دەچوو بەلام ئەم سەر بە فەرەنسا بوو

هەر لە ماوەی ئەم جەنگەدا چەند پاشایەکی گرنگ دەرکەوتن لە هەردوو لا وەک ( میری رەش کە کوڕی گەورەی ئەدواردی سێیەم بوو هەستا بە هێرشێک بۆ سەر فەرەنسیەکان و شکستی دان ، شارلی ژیر توانی بە هۆی ژیری و لێهاتویەوە متمانە بۆ فەرەنسیەکان بگەڕێنێتەوە ، گریسکلین یەکێک بوو لە سەرکردە دیارەکانی فەرەنسا لەماوەی جەنگەکەدا ) .

بۆرغدندیا یەکێک لە میرنشینە گرنگە دەرەبەگایەتیەکانی سەر بە تاجی فەرەنسی بوو بە تایبەت لە کۆتای سەدەی چوارەمدا لە ژێر سەرکردایەتی دۆق فلیپدا و ئەو توانی هەر چی زەوی نێوان بۆرغەندیا و فلاندرزی خستە سەر مەملەکەتەکەی و بۆ ماوەیەک دەسلاَتی خۆی بەسەر شارلی شەشەمی لاوازی برازایدا راگەیاند مەیش بوو بە هۆی نارەزای فەرەنسیەکان و سەر ئەنجام ( جۆنی ئازا ) پلانێکی دارِشت بۆ کوشتنی دۆق ئۆرلیان و ئەم کارەیش بو بە هۆی هەڵگیرسانی جەنگێکی ناوخۆی ماڵوێرانکەر لە نێوان هەر دوو سەربازگەی بۆرغەندی و ئۆرلیانیدا ، لەو دەمەدا فەرەنسا بە دەست ئەم هەموو ئاریشەوە دەیناڵاند دەسلاَتداری ئنگلیز ئەم هەلەی قۆستەوە لە سەردەمی هنری چوارەم و پێنجەمدا و پاش جەنگی ئاجنکۆرات لە ساڵی ١٤١٥ زاینی کە فەرەنسیەکان زۆر شتیان لە دەست چوو ناچار بوون بە قبوڵ کردنی پەیماننامەی ( ترۆی ) لە ساڵی ١٤٢٠ ئەم داگیرکاریەی ئنگلیز لای فەرەنسیەکان زۆر قێزەون و بێزار کەر بوو تا ئەو دەمەی دۆفێنی کورِی شارلی شەشەم توانی ئاهێک بۆ فەرەنسیەکان بگەرِێنێتەوە .

جان دارک لە ساڵی ١٤١٢ لە دایک بوە و لە ساڵی ١٤٣١ سوتێنرا ئەم کچە بوو بە بە ئەفسانەیەک بۆ فەرەنسیەکان و برِوای بە شارلی حەوتەم هێنا کە لە توانایدایە سەروەری بۆ فەرەنسا بگەرِێنێتەوە و سەرەرِاای ئەنجامدانی چەندین شەرِ بەڵام توانی گیانی نیشتیمانپەرەرێتی لای فەرەنسیەکان بەرز بکاتەوە و پاش دەست گیر کردنی لە لایەن ئنگلیزەکانەوە و دادگای کردنی بە چەندین تاوانی وەک جادوباز و بیدعە چی و هەڵگەرِاوە لە ئاین سەر ئەنجام برِیاری سوتاندنی درا ، جەنگی سەد ساڵە وەک جەنگێکی دەرەبەگایەتی دەستی پێ کرد و وەک جەنگێکی نەتەوایەتی کۆتای هات و کۆتای جەنگەکە بوو بە هۆی جیابوونەوەی تەواوەتی نێوان هەر دوو وولاَت و دروست بوونی گیانی نیشتیمان پەروەرەرێتی لە هەر دوو لادا و جەنگەکە

چۆن بە بێ ڕاگەیاندن دەستی پێ کرد بە بێ هیچ ڕێکەوتن و ڕاگەیاندێکش کۆتای هات .
جەنگی سەد ساڵە بە سەرکەوتنی فەرەنسیەکان کۆتای هات و دەبوو بە زوترین کات فەرەنسیەکان دەست بە ئاوەدانکردنەوەی وولات و دروست کردنی دەسلاتێکی ناوەندی بکەن و دانانی سنورێک بۆ هێزی بۆرغەندیا ، بە هاتنی لویسی یازدەیەم ( ١٤٦١ – ١٤٨٢ ) کە دەسلاتی هەبوو زۆر گڕانکاری رویدا بە تایبەت هەوڵ و کۆششی دۆقەکانی بۆرغەندیا و لویس سەرەڕای چاکی خۆی کۆمەڵێک کەسی باشی لە دەوری خۆی کۆ کردەوە و لە دەروبەری سەدەی پانزەدا هەرچی هەرێم و میرنشینی دەرەبەگایەتیە لەگەڵ مەملەکەتی فەرەنسی تێکەڵ بوون و ڕاستەوخۆ کەوتنە ژێر دەسلاتی ناوەندەوە .
لە سەدەی چواردەیەمدا ئەنجومەنی چینەکان پێگەیەکی گرنگی لە ژیانی سیاسی فەرەنسادا هەبوو هەرچەندە پاشتر تێوەکلا بە چەند کارێکی خراپ و نەشیاوەوە بۆیە ڕۆڵی خۆی لە دەست دا ، بە هاتنی ساڵی ١٥٠٠ پاشایەتی فەرەنسا سەرکەوتن بەسەر هەموو میر و دەرەبەگ و شارەکان و تا ڕادەیەکیش کەنسیەکانیش و زۆر کار کە پاشاکان دەستیان دایە لویسی دوانزەیەم توانی تەواوی بکات و خەڵکی بە گەشبینیەوە لە ئایندەی وولاتەکەیان دەڕوانی .
دوابەش لە بەشی حەوتەم باس لە ئیمراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز دەکات و لە سەرەتادا پێشینەیەکی مێژووی ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی باس دەکات بە تایبەت لە دوای سەدەی حەوتەمەوە و هەر لەم بەشەدا تیشک دەخاتە سەر ئیمبراتۆریەتی ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاوای بە تایبەت پاش تاج لەسەر نانی شارلمان لە ساڵی ٨٠٠ زاین لە لایەن پاپاوە و هەندێک لە مێژوونوسان ئەم روداوە بەسەرەتای ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز دەزانن کە لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە سەری هەڵداوە و تا ساڵی ١٠٨٦ ی خایاند و هەندێکی تر بە

دابەش بوونی مەسیحیەتی رۆژهەلات و رۆژئاوای دەزانن و بە هۆی داب و نەریت و بچوک بوونەوەی ئیمبراتۆریەتی گەورەوە سەرئەنجام لە ساڵی ٩٣٤ ی زاینی ئیمباتۆر کۆتای پێ هات بەلام هێتدەی نەخایاند بیرۆکەی ئیمبراتۆریەتیەکی تر سەری هەڵدا کە لە ( ئەڵمانیا ) بوو.
ئەڵمانیا مەملەکەتی فەرەنجیە رۆژهەلاتیەکان بوو کە بەر لویسی ئەڵمانی کەوت و پاشان بەر بنەماڵەکەی کەوت و لە ساڵی ٨٩٩ درایە لویسی بچکۆل کە بە مردنی دەسلاتی کارۆلینجی لە ئەڵمانیا کۆتای پێ هات و سەردەمی پاشایەتی دوای ئەو سەردەمە تایبەتمەند بوو بە دوو شتەوە ( زیاد کردنی مەترسی لە خۆرئاوا وەک هێرشی سلاڤ و هەنگاریەکان ، زیاد کردنی دەسلاتی دەرەبەگەکانی ئەڵمانیا ) لە ساڵی ٩١١ ئەڵمانیا لە چوار دۆقی گەورە پێک هاتبوو ، پرۆڤیسۆر جیمس ئۆمیسۆن بۆ مێژووی ئەڵمانیا و چەرخەکانی ناوەڕاست دەنوسێت " ئەڵمانیا لە ماوەی سەدەی ١٠ — ١٢ دا بەهێترین وولاتی ئەوروپا بووە و بنەماڵەی سەکسۆنەکان بنەمای ئەو بەهێزیان دارشت بەلام لە سەردەمی بنەماڵەی هۆنشتاوفنیشدا ئەڵمانیا گەیشتە ئەو پەڕی بێ هێزی و فەرەنسا جێگەی گرتەوە و ئەم بێ هێزیە درێژەی کێشا ... " .

**بنەماڵەی سەکسۆنەکان و بوونیان لە ئەڵمانیا و فەرمانڕەوایەتیان نیشانەی بۆ کراوە و ئاماژە بە چەند پاشایەکیان دەدات :**

١ — هنری یەکەم کە لە ساڵی ٩١٩ دەسلاتی گرتە دەست و لە ساڵی ٩٣٦ کۆتای بە دەسلاتی هات یەکەمین پاشای بنەماڵەی ساکسۆنەکان بووە و زۆر سیاسەتی ناوخۆی دارشت و ئەو سیاسەتەی پەیڕەو دەکرد کە دەیگوت " بۆ خۆت بژی و واز لە خلکانی تر بهێنە .... " ئەو توانی هێرشی هەریەکە لە هەنگاریەکان و سلاڤیەکان بۆ سەر فەرمانڕەوایەتیەکەی تێک بشگێنێ .

٢ — ئۆتۆی یەکەم کە لە ساڵی ٩٣٦ هاتی سەر حوکم و لە ساڵی ٩٧٢ کۆتای بە دەسلاتی هات و ئەم بە مەزنترین شای ساکسۆنیەکان دادەنرێت و

ئەڵمانیا لە سەدەی دە و یانزەیەمدا گەیشتە ئەو پەڕی هێز کە فەزڵی بۆ ئەم شایە دەگەڕێتەوە و زۆر بە حەماس بووە بۆ دروست کردنی ئەڵمانیایەکی بەهێز و لە سەردەمی ئەمدا ئەسقەفەکان زیاتر گرنگیان پێ دەدرا و رۆڵیان دیار بوو ، ئۆتۆی گەورە گەلێک جەنگی بەرپا کرد کە گرنگترنیان جەنگی ( لحفید ) بوو لە ساڵی ٩٥٥ کە توانی بەسەر مەجەڕەکاندا سەربکەوێت .

٣ – هاتنی هەریەکە لە ئۆتۆی دووەم ، ئۆتۆی سێ یەم ، هنری دووەم کە دەسڵاتیان لە ٩٧٣ دەست پێ دەکات تا ١٠٢٤ ی زاینی و ئەم سێ پاشایە لە سەر هەمان بنەما رۆیشتن کە ئۆتۆی گەورە دایڕشتبوو زۆر هەوڵیان دا بۆ گەڕانەوەی دەسڵاتی ئەڵمانیا لە ئیتالیا و بە مردنی هنری دووەم دەسڵاتی ساکسۆنەکان کۆتای پێ هات .

ئەڵمانیا لەسەردەمی بنەماڵەی فرانکفۆنیدا کە لە ساڵی ١٠٢٤ دەست پێ دەکات تاوەکو ساڵی ١١٢٥ و لەم بەشەدا جگە لە پێشەکیەک بۆ دەسکەوتی بنەماڵەی ساکسۆنی کە باسی دەکەن وەک زاڵبونیان بەسەر کەنیسە و تا رادەیەک پاپاکاندا تیشک خراوەتە سەر چەند پاشایەکی فرانکفۆنیدا :

١ – کۆنرادی دووەم کە لە ساڵی ١٠٢٤ – ١٠٣٩ دەسڵات دەگرێتە دەست و یەکێک بوو لە مەزنترین پاشاکانی ئەڵمانیا لە سەدەی ناوەڕستدا و زۆر دانا و ژیر تر بوو ، توانی زاڵ بێت بەسەر ئەسقەفەکان و گرنگیدان بە وەچاغ زادە بچوکەکان کە دواتر ئەمە بوو بە هۆی لاواز کردنی دەسڵاتی ناوەند .

٢ – هنری سێ یەم کە لە ساڵی ١٠٣٩ – ١٠٥٦ لە دەسڵاتدا بوو بە دواین پاشای ئەڵمانی دادەنرێت لە سەدەکانی ناوەڕستدا و تا رادەیەک سەرکەوتوو بوو لە کەم کردنەوەی دۆقەکان و دەسڵاتی خۆی لە وڵاتدا بەهێز کرد و و دەستی بەسەر کەنیسەدا گرت لە پاش کۆچی دوای ئەمە بۆ کوڕەکەی ( هنری چوارەم ) بوو بە کێشە .

٣ – هنری چوارەم کە لە ساڵی ١٠٥٦ – ١١٠٦ دەسەڵاتی گرتە دەست گەورەترین کۆسپ لە ماوەی فەرمانڕەوای ئەمدا کەنیسە و پاپاریەت بوو کە بە تەواوەتی توشی دارمان و گەندەڵی بوو بووەوە ، هنری چوارەم یەکێک بوو لە بەهێزترین پاشایانی ئەڵمانی و هاوکات بەدبەخترنیشیان بوو دەبوو ئەم پاشایە ڕووبەڕووی واجاخدغزادە و پیاوانی کەنیسە ببێتەوە و ئەوە بوو ئەو حەنگەی دەست پێ کرد و کار گەیشە ئەوەی کە ناو بە دیکتاتۆر دەر بکات و هاوکات لە ساڵی ١٠٧٣ ( هاڵدیراند ) کە جوتیارێکی ئیتالی بوو بە یەکێک لە گرنگترین پاپاکان دادەنرێت و ئەم پیاوە دەستی بە چاکسازی لە کەنیسەدا کرد و ئەمەیش بوو بەهۆی ململانیە لە نێوان دەستی پاشا و کەنیسەدا و سەر ئەنجام بە سەرکەوتنی پاپا کۆتای هات و ئەمیش بوو بە هۆی دیق کردنی هرنی چوارەم و دوای خۆی کوڕەکەی ( هنری پێنجەم ) هاتە سەر حوکم کە تا ساڵی ١١٢٥ لە دەسڵاتدا مایەوە .

ئەڵمانیا لە سەردەمی بنەماڵەی هۆهنشتاوفن کە لە ساڵی ١١٢٥ – ١٢٥٤ دەسڵاتیان گرتە دەست ئەویش دوای کۆچی هنری پێنجەم کە وەجاخ کوێر بوو هیچ منالێکی نەبوو پاش ٢٧ ساڵ ململانیەی نێوان هەردوو بنەماڵەی (هۆهنشتاوفن و گۆڵفز ) کە سەر ئەنجام یەکەم پاشای بنەماڵەی یەکەم فەریدریکی یەکەم هاتە سەر حوکم کە ئاماژە بە چەند پاشایەکیان دراوە:

فەریدریک بەربروسی کە لە ساڵی ١١٥٣ – ١١٩٠ لە حوکمدا بوو لە پاشا گرنگەکانی ئەڵمانیا دادەنرێت و پیاوێکی وریا و ئازا بووە و زۆر بڕوای بە بیرۆکەی ئیمبراتۆر هەبووە و هەر بۆیە لە پێناوەدا جەنگاوە بە تایبەت لەگەڵ پاپاکاندا و چەندین هێرش و شەڕ و پەیماننامەی گرێ داوە لەوانە پەیمانامەی ( کۆنستانس) و هێرشی خاچ پەرستی سێیەم فەردەریک لە ساڵی ١١٨٨ بەشدار بوو بەڵام لە کاتی چونی لە ڕێگە لە ئاودا خنکا .

هنری شەشەم کە لە ساڵی ١١٩٠ – ١١٩٧ دەسڵاتی هەبوو و پاش کۆچی باوکی هاتە سەر حوکم و ماوەی دەسڵاتی ئەم بە ململانیەکی زۆر دادەنرێت

لە نێوان دەسلاتی ئیمبراتۆر و پاپادا و ئەو کاتەی کە خۆی بۆ جەنگی خاچ پەرستەکان ئامادە دەکرد لە تەمەنی لاوێتیدا کە ٣٢ ساڵ بوو کۆچی دوای کرد و کۆچی دوای هنری واتا کۆتای دەسلاتی ئەڵمانیا لە ئیتالیا و لە ناوچونی خەونی دەوڵەتێکی ئەڵمانی بەهێز .

بە کۆچی دوای هنری شەشەم ئیتالیا هەناسەی ئاسودەی هەڵمژی و باکوری ئیتالیا سەربەخۆی راگەیاند و لەو وەختەدا ( ئەنۆسسنتی سێیەم ) هاتە سەر عەرشی پاپا لە ساڵی ١١٩٨ – ١٢١٦ لە حوکم مایەوە کە کەسێکی ژیر و لێ هاتوو بوو وە لە زانکۆ چەند زانستێکی خوێند .

لە ئەڵمانیا دوای مردنی هنری شەشەم ململانیە لە نێوان هۆهنشتاوفن و ولفیەکان بۆ گرتە دەستی دەسلات درێژەی کێشا کە چوارده ساڵی خایاند کە سەر ئەنجام فەردەریکی دووەم بوو بە پاشای ئەڵمانیا .

فەردەریکی دووەم کە لە ساڵی ١٢١٥ – ١٢٥٠ لە سەر حوکمدا بوو سەرەتا پەیوەندی لەگەڵ پاپادا باش بوو بەڵام دواتر پەیوەندیان ئاڵۆز بوو بەتایبەت ئەو دەمەی کە فەردەریک خۆی دزیەوە لە جەنگی خاچ پەرستەکان و ئەمەیش پاپای تورە کرد و سەر ئەنجام کەنیسە و دەسلاتی کەنسە توانیان دەسکەوتێکی تر بەدی بهێنن و لە پاش کۆچی پاشا لە ساڵی ١٢٥٠ کوڕەکەی هاتە سەر حوکم ( کۆنراد ) و ئەمیش نەیتوانی لە سەر حوکم بێتەوە و ناچار هەڵهات بۆ ئیتالیا .

لە دوا بەشی ئەم بابەتدا باس لە ئەڵمانیا دەکات لە دوای ساڵی ١٢٥٠ ەوە و تێیدا هاتووە کە ئەو وڵاتە لە سەدەی ١١ و ١٢ دا بەهێزترین دەوڵەتی ئەورووپی بووە بەڵام لە سەدەی ١٣ دا ئەو بەهێزیە لە ناو چوو لە سەدەی ١٤ و ١٥ یشدا دەرکەوتنی پاشایەتی بەهێز و پێشکەوتنی دەسلاتی ناوەند بوو ، **هۆکارەکانی پێشنەکەوتنی ئەڵمانیا وەک فەرەنسا و بەریتانیا بۆ ئەم هۆکارانە دەگەڕێتەوە :**

١- هەڵبژاردنی پاشا لەسەر بنەمای پشتاو پشت .

٢ – هێزە دەرەبەگی و خێڵەکیەکان بە باشی سودیان لێ نەدەبینرا .
٣ – تێوەگلان و سەرقاڵبوون بە ئیتالیا و پاپاریەتەوە ....
لە سەدەکانی ١٣ و ١٤ دا کۆمەڵێکی زۆر لە دەسڵاتداران دەرکەوتن بە ناوی جۆربەجۆر وەک ( تارکدۆق ، دۆق ، کۆنت ... ) کە حوکمیان دەکرد و لەو دەمەدا چەندین قەوارەی نوێ دەرکەوت کە بریتی بوون لە شارەکان .
دوای ئەو سەرگەردانیەی ئەڵمانیای گرتەوە عەرشی دەسڵات بە جۆڵی مایەوە تا ئەو کاتەی بنەماڵەیەکی گرنگ هاتن بە ناوی هیبسسبۆرگ کە لە بنەچەدا خەڵکی ( ئەلزاس ) ی سویسرا بوون و لە سەدەکانی ١٥ و ١٦ دا توانیان دەست بەسەر ئەوروپادا بگرن و تا کۆتای جەنگی جیهانی یەکەم لە ساڵی ١٩١٨ لە ژێر دەستیان مایەوە و بەمشێوەیە کێشمەکێش لە نێوان بنەماڵەکاندا درێژەی کێشا تا ئەو کاتەی کە لە کۆتای ئەم بەشەدا ئاماژە بە بنەماڵەی هۆهنزلرن دەکات کی رۆڵێکی گرنگی بینەوە لە ئەوروپا و ئەڵمانیا لە سەدەکانی داهاتودا .

## ✓ بەشی هەشتەم

بەشی هەشتەم کە دوا بەشی ئەم کتێبەیە تەرخان کراوە بۆ جەنگی خاچ پەرستەکان وەک باگراوندێکی مێژووی باس لەم جەنگە دەکات کە ئەوروپای مەسیحی کردیانە سەر وڵاتە عەرەبیەکان لە دەی کۆتای سەدەی ١١ دەستی پێ کرد کە نزیکەی دوو سەد ساڵی خایاند ( ١٠٩٦ – ١٢٩١ ) زاینی .

**پاڵنەکارەکانی جەنگی خاچ پەرستی کراوەتە چەند بەشێکەوە لەوانە :**

١ پاڵنەری ئاینی : کەنیسەی خۆرئاوا بەردەوام شوێنکەوتوانی هان دەدا بۆ دژایەتی کردنی موسڵمانەکان و جەنگانی لەگەڵیان بە ئەرکێکی پیرۆز دەزانی کە ئەمەیش هانی مەسیحیەکانی دا کە لەو جەنگەدا بەشدار بن ، هاوکات ئەو هەموو دژواریانەی کە دەهاتە رێی ئەو حەجاجانەی کە دەهاتن

بۆ خاکی پیرۆز لە ( بیت المقدیس ) ئەمیش بەهانەی دا بە دەست پاشاکانەوە بۆ جەنگ کردن بە تایبەت پاش ئەوەی کە سەلجوقیەکان دەرکەوتن و بە توندی کەوتە گیانی حاجیە مەسیحیەکان .

٢ - پاڵنەرە ئابوری و بازرگانیەکان : تەماعی دەرەبەگە فەرەنسی و بازرگانە ئیتالیەکان کە ئاین بە لای ئەوانەوە هۆیەک بوو بۆ گەیشتن بە مەرامە بازرگانی وسیاسیەکان و دەرەبەکە فەرەنسیەکان زەوی زۆریان دەسکەوت و بازرگانەکانیش بە هۆی بەشداریان قازانجی زۆریان دەست کەوت دەکرێت بە کورتی جەنگی خاج پەرستی بە جەنگێکی داگیرکاری ئەوروپی دژی جیهانی ئیسلامی بزتنرێت .

**پێشکەوتنی جەنگی خاچ پەرستان کە دەتوانین ئەم جەنگە بکەین بە چەند قوناغ و هەڵمەتێکەوە :**

### ❖ هەڵمەتی یەکەمی خاچپەرستی :

١ هەڵمەتی میللی : ژمارەیەکی زۆر لە جوتیار و خەڵک بۆ ئەو جەنگە ئامادە کران کە شارەزای زۆریان لە هونەری جەنگدا نەبوو و بە سەرکردایەتی واڵتەر بەرەو قوستەنتینیە بەرێ کەوتن بەڵام لە رێگەی توشی کەم خۆراکی و جەنگی مەجەڕەکان هاتن و پاش ئەوەی جارێکی تر بەڕێکەوتنەوە بەڵام دیسان لەسەر دەستی تورکەکان توشی شکست هاتن و ئەم هێرشە هیچ ئامانجێکی سەربازی نەپێکا .

٢ — هەڵمەتی میرەکان : هەڵمەتی میرەکان لە هاوینی ١٠٩٦ دا دەستی پێ کرد کە بە زۆری لە فەرەنسیەکان پێک هاتبوو و هەڵمەتەکە لە چەند سریەک پێک هاتبوو وە هەر سریەکیش لە ژێر میرێکی دەرەبەگدا بوو ، لە میرە بەناوبانگەکان کە تێیدا بەشدار بوون هەریەکە لە ( جۆدفری دی بوایۆن ، بلدرێن ) بوون کە سوپایەکی ١٥٠ هەزار پیاوی پێک هێنرا و بڕیار بوو هەموویان لە قوستەنتینیە یەک بگرن بەڵام بەهۆی ناکۆکی و

جیاوازگەلێکی زۆر ئەم هەڵمەتەیش سەری نەگرت بە تایبەت جیاوازی نێوان کەنیسەی رۆژهەڵاتی و رۆژئاوای و زمان و دابو نەریتیان .
بە هۆی بارودۆخی جیهانی ئیسلامی لەو دەمەدا کە یەکەیەکی سیاسی یەکگرتوو و سەرکردەیەکی لێ هاتبووی نەبوو وای کرد کە خاچ پەرستەکان پەلاماریان بدەن هەرچەندە سەلجوقیەکان و حەمیە سەربازەکانیش هەبوون بەڵام سەر ئەنجام لە ساڵی ١٠٩٧ حاچ پەرستەکان لە پسفۆڕەوە پەڕینەوە بەرەو رۆژهەڵات و ( نقیە ) یان داگیر کرد و پێشڕەوریان کرد بۆ داگیر کردنی شاری ئەنتاکیە و پاش هاتنی گەشتی گەلی ئیتالی زیاتر رێگە بۆ خاچ پەرستان ئاسان بوو لەوەی جگە لە رێگەی ووشکانی توانیان رێگەی دەریایش تاقی بکەنەوە و لە پاشان توانرا لە رۆژهەڵاتدا چوار میرنشین یان دەوڵەتی بچوک دابمەزرێنن ( رەها ، ئەنتاکیا ، تەرابلوس و مەملەکەتی قودس ) کە لە هەر چوار نیمچە دەوڵەتەکەدا سیستەمی حوکم رانی لەگەڵ داب و نەریتی دەرەبەگایەتیدا پێک دەهاتەوە و پاشان دێری خۆرئاوا هێنرایە خۆرهەڵات و چالاکی ئابوری لە شارە کەناریەکاندا پەرەی سەند ، بە هۆی هێرشی بەردەوامی موسڵمانەکان خاچپەرستەکان زیاتر گرنگیان بە هێزی بەرگری دەدا بەڵام بە هۆی بوونی چەند خاڵێکی لاوازەوە و پاش بەهێز بوونی موسڵمانەکان و هاتنی سەرکردەیەکی بەهێز توانیان مەملەکەتی خاچپەرستەکان یەک بە دوای یەکدا تێک بدەن .
دەوڵەتی سەلجوقی کە لە سەدەی ١٥ دا روخا پاشماویان مابوو کە بە ئەتابکە ناسراوبوون و بە تایبەت ئەتابکەکانی موسڵ لە ساڵی ١١٣٧ حوکمڕانی موسڵمانیان دەکرد پاشتر میرنشینەکەیان فراوان بوو ، لە الّی ١١٤٤ عیمادەدین توانی شاری رەها لە دەستی خاچ پەرستەکان بسێنێ و و پاش پەنجا ساڵ یەکەم میرنشینی حاچ پەرستەکان روخا .

### ❖ هەڵمەتی دووەمی خاچپەرستی :

هەوڵی روخانی رەها گەیشتە ئەوروپا و ئەمەیش بووە مایەی بێزاری و تورەی زۆر بۆیە پاش پێک هێنانی سوپایەکی بەهێز کە لویی حەوتەمی پاشای فەرەنسی و کۆنرادی سێیەمی ئەڵمانیا ی تێدا بوو بەرەو رۆژهەلات کەوتنەڕێ بەلام ئەم هەڵمە شکستی خوارد بە تایبەت پاش دەرکەوتنی سەلاحەدینی ئەیوبی و یەکخستنی شام و میسر و پاش خۆ ئامادە کرد بۆ رزگار کردنی بیت المقدیس و لە سالانی ١١٨٥ و ١١٨٦ چەند سەرکەوتنێکی تۆمار کرد ، جەنگی یەکلاکەرەوەی ( حتین ) لە سالی ١١٨٧ رویدا کە تێیدا خاچپەرستەکان شکان و نزیکەی ١٥٠٠ سەربازی سوارە و ٢٠ هەزار سەربازی پیادە تیاچوو جگە لە لەدەست چونی شاری سور .

### ❖ هەڵمەتی سێیەمی خاچپەرستی :

پاش گرتنی قودس نارەزای زۆر لە ئەوروپا بلاو بووەوە بۆیە سوپایەکی بەهێز پێک هێنرا بە بەشداری هەرسێ پاشا ( فریدریکی یەکەمی ئەڵمانی ، ریچاردی یەکەمی بەریتانی و فلیپ ئۆغستسی فەرەنسی ) هەر بۆیە ئەم هەڵمەتە بە هەڵمەتی پاشایان ناو دەبرێت ، هەردوو پاشا فەریدریک و ئۆغستس زوو شکستیان هێنا بەلام ریچارد گەیشتە فەلەستین کە بە پیاوێکی ئازا و بە جەرگ ناوی دەر کردبوو و هەریەکە لە موسڵمان و مەسیحیەکان لە سایەی ریچارد و سەلاحەدیندا نمونەی مەردایەتیان بینی و سەرەڕای بوونی شەڕ لە نێوانیاندا بەلام دۆستایەتیان هەبوو پاش هەوڵێکی زۆر ریچارد نەیتوانی قودس بگەڕێنێتەوە بۆ خاچپەرستەکان هەر بۆیە لە سالی ١١٩٢ گەڕایەوە بۆ ئەوروپا ، لەماوەی سەدەی ١٣دا هەستێکی دژ بە جەنگی خاچ پەرستان دروست بوو سەرەڕای گوێ پێنەدانی پاپاکان بەو جەنگە و خۆ خەریک کردن بە کاروباری ناوخۆ بە تایبەت روبەروبونەوەی بیدعە چیەکان ئەمیش وای کرد کە جەنگی خۆرهەلات لەو دەمەدا بایەخی نەمێنێ .

### ❖ هەڵمەتی چوارەمی جەنگی خاچ پەرستی :

لـەم هـەڵمـەتـەدابـە روونـی دەردەکـەوێت پاڵنـەری سـەرەکـی بـۆ جـەنـگ بەرژەوەندی سیاسی و ئابوری بوو بەڵام بە حەماسی ئاینی پەردە پۆش کـرا بوو و سەرکردەی هەڵمەتەکەیش ( ئەنۆسـنتی سـێ یـەم ) بـوو کـە لـەگـەڵ ڤینسەکان رێک کەوت و سەر ئـەنجـام لـەم هـەڵمـەتـەدا سـەرەڕای نـا رەزای کەنیسە بەڵام قوستەنتینیـە داگیـر کـرا کـە تـا سـاڵی ١٢٦١ بیـزەنتینیـەکـان نەیانتوانی شارەکەیان رزگار بکەن .

پاش ئەم هەڵمەتانە هەریەکە لە فەریدریکی دووەم و قەدیس لویس جـەنگی خاچ پەرستیان ئەنجامدا بەڵام هیچی سەرکەوتوو نـەبـوو ، هێرشـی قـەدیـس لویس بە دوایـن هێرشـی خـاچ پـەرستـەکـان بـۆ سـەر وڵاتـانی موسـڵمان و عەرەبی دادەنرێت .

دواین بابـەتـی ئـەم بـەشـە تایبـەت کـراوە بـە کاریگـەری جـەنگـەکـانی خـاچ پەرستی لەسەر ئـەوروپـا و تێیـدا هـاتووە ئـەم جـەنگـە لـە رووی سیاسـی و ئـابوری و کۆمـەڵایـەتـی و رۆشـنبیریەوە چـەنـد ئـەنجـامێکی گرنگـی لـەسـەر ئەوروپا دانا :

١ — لە رووی ئابوریەوە : ئەم جەنگە بوو بە هـۆی چـاکتر کردنـی بازرگـانی ئەوروپا بە تایبەت ئیتالیەکان لەگـەڵ گـەلانـی موسـڵماندا و دوای جـەنگیش کاڵاکانیان بۆ رۆژهەڵات هەر دەهات

٢ — لە رووی رۆشنبیریەوە : بە هۆی ئەوەی کە ئەورپایەکـان لـە رێگـەیـەک دەگەڕان بۆ هاتنیان بۆ رۆژهەڵات  ئەمەیش بە سەرەتای دۆزینەوەی زانسـتی جوگرافیا دادەنرێت کە شۆڕشێکی مەزنی مرۆڤایەتی بوو .

٣ — لـە رووی کۆمـەڵایـەتیـەوە  : گـەشـەکردنـی بازرگـانی بـوو بـە هـۆی دەرکەوتنی چینی بورژوازی لەسەر حیسابی چینە ئۆروستوکراتیەکە ئەمەیش رۆڵی گرنگی لە هەڵوەشاندنەوەی دەرەبەگایەتیدا هەبوو .

٤- لە رووی سەربازیەوە : ئەوروپا زۆر شت لە موسڵمانەکانەوە فێر بوو وەک بەکارهێنانی چەکی سوک و پشت بەستن بە هێزی پیادە و دروست کردنی قەڵا .

لە کۆتایدا دەگەینە ئەوەی کە هەریەکە لەو بەشانەی کە لەو کتێبەدا هاتووە تایبەتە بە چەند روداوێکی گرنگ کە دەتوانرێ چوار بەشی سەرەتای کتێبەکە بەوە سەیر بکرێت کە تایبەتە بە ململانیەی ناوخۆی ئەوروپا و دەرکەوتنی هۆزەکان و زیاتر کار لەسەر ئەو کیشوەرە کراوە بەو شێوەی کە لە کۆمەڵگەیەکی خێڵەکی چووە ، چوار بەشی تری کتێبەکە دەتوانرێ بەوە سەیر بکرێت کە ئەوروپا لە قوناغی پێک هێنان و خۆ گرتنەوەدایە و هەنگاوی بۆ دروست بون ناوە و تەنانەت لە پەلی هاوێشتوە بۆ دەرەوەی سنوری خۆی و لە تێکڕای سەردەمەکاندا پشتاوپشتی بۆ هاتنە سەر دەسڵات رەنگی داوەتەوە کە کاری سلبی لەسەر ژیانی ئەوروپا دناوە لەگەڵ دەسڵاتی ئاینی کە بەردەوام لە کێشمە کێشدا بووە و بە چەندین قوناغدا تێپەڕیەوە و زۆر تر لە خزمەتی کۆمەڵێک خەڵکدا بووە هەر بۆیە ئاینی مەیسحی و کلێسا چەندین جار ریفۆرمی تێدا کراوە .

لێرەدا سەرەڕای دەست خۆشی زۆر بۆ مامۆستا مستەفا سەعید کە بە ئەم ئەرکە هەستاوە کە من هیوای بەرهەمی باشتری بۆ دەخوازم ، چەند تێبین و رەخنەیەک دەخەمە روو بە ئومێدی سود بینین بۆ پرۆژەی داهاتوو :

١ – نەبوونی پێشەکی خودی وەرگێر و پێشەکی نوسەران کە گرنگ بوو لە کتێبەکەدا هەبوایە .

٢ – وەک دەوترێت کاغەزی بێ وێنە وەک زەوی بیابان وایە ، لەم کتێبەیشدا هیچ وێنە و نەخشە و هێڵکاریەک بەدی ناکرێت کە رەنگە بۆ خوێنەر بە سود بێت .

٣ – نەبونی پەراوێز بۆ هەندێک زاراوە و ووشە کە دەکرا وەک ئەرکێکی وەرگێڕ مامۆستا بەم کارە هەستایە بۆ زیاتر دەوڵەمەند کردنی بەرهەمەکە .
٤ – بوونی هەندێک هەڵەی چاپ و زمانەوانی وەک ( لە لاپەڕە ١٦١ و ١٨٨ دا بۆ جەنگی سەد ساڵە رویداوە ، یان لە لاپەڕە ١٣٧ دا لە سەرەتای پەرە گرافەکەوە نوسراوە " وا دێتە بڕوا بوون کە بنەچەکی کڵێساکان بگەڕێتەوە بۆ ناوچەی .... " کە جوانتر بوو بنوسرێت " بڕوا وایە یان رەنگە بنەچەی یان بنەڕەتی "....
٥ – کاتێک کە ناوی کەسایەتیەک دەبینیت لە بەرامبەری لە نێو کەوانەدا ساڵێک نوسراوە بۆ نمونە " هنری چوارەم ( ١٠٥٦ – ١١٠٦ ) ی زاینی کە ئەمە لە کتێبەکەدا ئاماژەیە بۆ ساڵی حوکمڕانی و ئامـاژەیش بەوە نەدراوە کە وایە ، خوێنەری کورد لەسەر ئەوە راهاتووە کە ئەوە ئاماژەیە بۆ لەدایک بوون و مردن .
٦ – هەندێک ووشە هەیە کە مامۆستا دەق لە عەرەبیەکەوە وەری گرتووە کە دەبوو ئەسڵیەکەی وەر
٧ – خۆزگە مامۆستا ئاماژەی بەو سەرچاوانە بدایە کە سودی لێ وەرگیراوە بۆ ئەم کتێبە بۆ زیاتر ئاشنا کردنی خوێنەری کورد بە سەرچاوەکان .
**کتێبی ( مێژووی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ) ، دانانی ( د . عبدالامیر محمد امین ، محمد توفیق حسین ) ، وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە ( مستەفا سەعید عەلی ) ، پێداچونەوەی ( مامۆستا سیامەند کەریم مەولود ) ، چاپی یەکەم – ساڵی چاپ ٢٠١١ ، شوێنی چاپ ( چوار چرا ) لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی هەوراما**



بیزەنتی



دەرەبەگایەتی لە ئەوروپا



ئەشكەنجە و ئازاردان لە سەدەكانی ناوەراستدا

دەروازەی دووەم

# چاکسازی ئایینی

بەشی یەکەم

- تێڕوانینێک بۆ ئاین
- کورتەیەک لە مێژووی ئاینی مەسیحی
- ئەوروپا لە سەردەمی ڕێنیسانسدا

# تێڕوانینێک بۆ ئایین

ئاین ئاوێنەیە لەگەڵ ژیانی مرۆڤایەتیدا بەڵام دیسان پێویستی بە ناسین هەیە ، مرۆڤەکان بە زۆری تێدەکۆشن تاوەکو هەوڵی زیاتر بدەن بۆ ناسینی ئاین ، رووبەڕوبونەوەی مرۆڤ لەگەڵ ئایندا بە سێ شێوە روو دەدات ( تێڕوانینێکی پەرستشانە سەبارەت بە ئاین و بیروڕاکانی و رەت کردنەوەی ئاینەکانی تر ، تێڕوانینی فەیلەسوفانە بۆ ئاین ئەمەیش لە رێگەی فکرەوە بە جۆرێک مرۆڤ قایل بکات ، ئەڵتەرناتیڤیکی لێکۆڵەرانە بۆ باشتر ناسینی ئاینەکان ) . (١)

ئاین بە هۆی ئەو دەوڵەمەندییە جۆر بە جۆریەی کە هەیەتی بۆ لێکۆڵینەوە ناڕەحەتی زۆری تێدایە و پەیوەندی مرۆڤ بە ئاین زیاتر تاکە کەسیە ، بە وتەی "ویلیام جیمز " پەیوەندی ئێمە لەگەڵ ( هەستەکان ، کردار ، ئەزمونی تاکە کەسەکاندایە ) ، ئاین مرۆڤەکان هان دەدات تاوەکو ئەرکەکانی رۆژانەیان ئەنجام بدەن و ئامادەشیان دەکات بۆ ئەو چارەنوسەی کە خۆیان نایەنەوێت . (٢)

ئاین لە لای فەیلەسوف و زانایان و پێغەمبەران بۆچونی جیای لەسەر دراوە و هەر یەکە تێڕوانینی خۆی بۆی هەیە وەک مرۆڤێک ، لە لای باوەڕداران ئاین رێگە نیشاندەری مرۆڤە بۆ ئاخیرەت و چەندین پێغەمبەر بۆ ئەو مەبەستە لە لایەن خوداوە نێدراوە کە بە پێی سەرچاوە مێژوویەکان چەندین نەتەوە هەبون و بیرو باوەڕی ئاینیان هەبووە وەک ئاینی ( جولەکە ، مەسیحی ، ئیسلام ... ) و ئاینەکانی تری وەک زەردەشتی و بوزی و ئاینی تری زەمینی کە هەندێکیان بۆ میلەتە درێرینەکانی کیشوەرە کۆنەکانی جیهان دەگەڕێنەوە بە تایبەت لە وڵاتی دوو روبارەکە و دۆڵی نیل . (٣)

لە بیروباوەڕی ئیسلامدا مرۆڤ بۆ ئەوە دروست کراوە کە خوا بپەرستێت و یەکێک لە ئەرکانی سەر شانی مرۆڤ ناسینی خودایە گەر وا نەبێت ئەوا لە

ریزی ئاژەڵاندایە و خوا مرۆڤی وا دروست کردووە کە لە هەموو گیانلەبەرێک گەورە تر و بەرێز ترە و پێویستە مرۆڤ حاوەن ئاینێکی یەکتاپەرست بێت و تەنها ئاین لای خوا ئیسلامە بە پێی دەقی قورئان . (٤)

گەر رای چەند فەیلەسوف و بیرمەندێکی ئەوروپی وەر بگرین دەبینین کەسێکی وەک مارکس سەرەڕای ئەوەی کە پێی وایە ئاین بەرهەمی ئابوریە دەڵێت " ئاین جگە لەو کاردانەوانە و کاریگەریە خەیاڵیانەی کە هێزە دەرەکیەکان بەسەر مرۆڤدا دەیسەپێنێت هیچی تر نیە . (٥)

فەیلەسوفێکی وەک نیچە سەرەڕای ئەوەی باوەڕی بە هیچ ئاینێک نیە لەو ئاینانەی کە لە جیهاندا هەن و بە بڕوای ئەو رۆحی ئاینی سەبارەت بە هەر ئەرک و تێگەیشتنێک لە یاساکانی سروشت هەژارە ، نیچە بڕوای وایە ئەقڵیەتی ئاینی پێچەوانی ئەقڵی زانستە و رەخنە توندەکانی ئەم زانایە بە تایبەت لە ئاینی مەسیحیەتە . (٦)

مێژووی ئاین کە هەوڵ و کۆششی هەموو مرۆڤایەتیە روبەرێکی فراوانی گەشاوەی ماناهێنەرە کە مانای ئاماژەکان و نیشانەکان و کردارەکان و رەفتارەکانی مرۆڤ ئاشکرا دەکات ، مێژووی ئاین لەگەڵ دەست پێ کردنی مێژووی مرۆڤایەتیدا دەست پێ دەکات و مرۆڤ هەرچیەک بێت خوێندەوار یان نەخوێندەوار سەرەتای یان پێشکەوتوو لە هەوڵی پڕ کردنەوەی پێداویستیەکانیدایە بە ئاینیشەوە . (٧)

بە شێوەیەکی تر گەر ئایین بە مانای ( پەرستنی هێزە باڵاکانی سروشت ) پیناسە بکەین ئەوا دەبێت ئەوە لە بەرچاو بگرین کە هەندێک لە نەتەوە سەرەتایاکان هیچ ئاینێکیان نەبووە بۆ نمونە هەندێک لە هۆزە ئەفریقاییەکان هیچ تۆتیم و بت و خوایەکیان نیە کە بیی پەرستن ، بە سەیر کردنی هەموو دیاردە رۆحیەکانی مرۆڤ بۆ پەرستن دەبینین کە ئاین دەرکەوتەیەکە هەموو تاکەکانی مرۆڤ لە خۆ دەگرێت هەر بۆیە دەتوانین بڵێین ئایین لە کۆنەوە لەگەڵ مێژوو هاوڕێ بووە ، هەر یەکە لە ( ترس ، سەرسوڕمان ، خەونەکان

، رۆح و رۆحگەرایی ) بە سەرچاوەکانی ئـاین دادەنـرێن و ( لۆکلاتیۆسـی ) حەکیمی رۆما وتویەتی " ترس یەکەمین دایکی خواکانە " و لە نێو پلـەکـانی ترسدا ترس لە مردن جێگەیەکی گرنگتری هەیە .
بە گشتی لەم جیهانەدا دەبین کـە پـڕە لـە خـوا و هـەر تاشـە بـەردێک یـان ئـەسـتێرەیـەک بـە خوایـەک رەنـگ دەداتــەوە ، ژمـارەی ئـەو شـتانەی کـە دەپەرسترێت بۆ ئـەژمـارەن و دەتـوانین ئـەم خـوا بـۆ ئـەژمارانـە لـە شـەش دەستەدا پۆلێن بکەین ( ئاسمانی ، زەمینی ، سێکسی ، ئاژەڵی ، مرۆیـی و ئیلاهی ) سروشتیە کە نەتوانین بڵێین یەکەمین شت کە ستایش کراوە چـی بووە بەڵام رەنگە ( مانگ ) لەو گروپە بێت کە دەخرێتە پێشەوە .
هەمیشە لە نێو کۆمەڵ و شارستانیەتە باڵاکاندا کێشمەکێشێک لە نێوان ئاین و کۆمەڵدا بوونی هەیە کاتێک کە ئاین لە سەرەتادا داکۆکی لـە مرۆڤـی لاواز و ماندوو دەدات و کە ئەو دەگاتە لۆتکە و دەتوانێت نـەتـەوە دروسـت بکـات لێکخشاندن دروسـت دەبێـت ئـەو کاتـەی ئـاین بـەرگـری لـە رابـردووی خـۆی دەکات واتا شەڕ لە نێوان زانست و ئایندا دروست دەبێت و ئەو کاروبارانـەی کە لە ژێر چاودێری پیاوانی ئاینیدان وەک کاروباری مـاف و سـزادان و ژن و ژنخــوازی و تــەڵاق لــە ژێــر دەســتیان دەردەهێنرێــت و دەدرێتــە دەســت رێکخراوێکی دنیای کە ئەمەیش بە بڕوای پیاوانی ئاینی بـە لادان لـە شـەرع دەزانرێت و ئەمەیش دەبێتە هۆی فەوتان و نەمان نەمان بە مانای خەڵک کە لەگەڵ خۆی ئەو ئاینەیش دەبـات و بـەڵام هـەمـدیس ئـارەزووی مـرۆڤ سـەر هەڵدەداتەوە و شارستانیەتی نوێ و ئاینی تازەتر دروست دەبێت . (٨)
ئاین لەسەر گۆی زەوی بە ئەندازی کۆنی مرۆڤ لەسەر رووی زەوی و ژیـانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ لەسەر ئـەم زەمینـە کۆنـە بـەڵام دیـاری کردنـی لـە رووی شوێن و کاتەوە مەحاڵە هەر وەک چۆن پێناسە کردنی مەحاڵـە چونکـە ئـەم دیاری کردنە لەسەر مرۆڤ خـۆی هێـشتا نـەزانـراوە بـەڵام ئـەوە زانـراوە کـە باوەڕ بە ئاین لە چەندەها شوێنی جیهان لە نێـو کـۆنترین کۆمـەڵانـی مرۆڤـدا

بینراوە ، دەتوانین بڵێین دیاردەی ئاین یەکێکە لە هەرە دیاردە کۆنەکان کە هەر لە سەرەتای ژیارەوە بوونی هەبووە و یەکێکە لە پێکهێنەرە بنەڕەتیەکانی ژیان و بەم پێیەش زۆربەی مرۆڤەکان ئایندارن .
ئاین بە یەکێک لە پێکهێنەرە بنەڕەتیەکانی هەر ژیارێک دادەنرێت و بە بڕوای سەید حسێن نەسر ئاین دڵی شارستانیەتە ، بە بۆچونی ناسری بۆ ئەوەی گفتوگۆی ژیاری دروست ببێت دەبێت گفتوگۆ لەسەر ئاین بکەین و بە بڕوای ( ماکس ڤیبر ) گرنگی ئاین تەنها لە چوارچێوەی مامەڵەی ئیمانەکەیدا کورت نابێتەوە و بەڵکو ئامانجی زیاتری هەیە کە بریتیە لە بەدەست هێنانی بەختیاری مرۆڤ و بە بڕوای ماکس ڤیبر پێناسەی ئاین پێش لێکۆڵینەوە لەو ئاینە نە دروستە و نە دەکرێت .
ئاین لە لای ئیمیل دۆرگهایم ( ١٨٠٨ – ١٩١٧ ) ز ئەم زانایە بە دامەزرێنەری کۆمەڵناسی دادەنرێت لە فەرەنسا لە هەر دوو بواری تیۆری و پراکتیکی و کاریگەرێکی زۆری هەبوو لەسەر کۆمەڵناسی ئاین و دۆرگهایم یەکەمین کەسانێکە کە لە روانگەی کۆمەڵناسیەوە لە ئاینی کۆڵیوەتەوە لەو کتێبەکەیدا ( فۆرمە سەرەتاییەکانی ژیانی ئاینی ) ، ئەم زانایە بەم شێوە لە ئاین دەڕوانێت " ئاین سیستەمێکی بەیەکەوە گرێ دراوی بیروباوەڕ و کرداری پەیوەست بە شتە پیروزەکانە ، واتا ئەو شتانەی کە جیان لە شتە ئاسایەکانی تر و لە ریزی شتە قەدەغەکراوەکان دادەنرێت و ئەم بیروباوەڕ و کردارانە گشت ئەو کەسانە پەیڕەوی لێ دەکەن کە لە کۆمەڵێکی ئەخلاقی بە ناو کڵێسا یەکدەخرێن " ، دۆرکهایم لە روانگەی ئاینی مەسیحی و کڵیساوە لە دیاردەی ئاینی کۆڵیوەتەوە ... (٩)

# كورتەیەک لە مێژووی ئاینی مەسیحی

مەسیحیەت لە سەدەی یەکەمی زاینی لە فەلەستین دەرکەوت و مەسیح ( علیه السلام ) لە سەردەمی ئیمبراتۆر ئۆگەستس ( ٢٧ پ . ز – ١٤ ز ) لە دایک بووە .(١٠)

ئەم ئاینە زۆر بە خێرای بە رۆژهەلات و رۆژئاوای ئیمبراتۆریەتی رۆمانیدا بلاوبووتەوە ئەمیش بە هۆی سروشتی پێک هاتەی رۆما ، مەسیحیەت سەرەتا لە نێو هەژاراندا بلاو بووەوە پاشان هەموو چین و توێژەکانی گرتەوە و هۆی سەرکەوتنی ئاینەکەیش بۆ ئەو دەستەو تاقمە دەگەرێتەوە کە بە قوتابیە نزیکەکانی مەسیح کە پێیان دەوترێت پێغەمبەران و حەوارییەکان . (١١)

هۆکاری بلاو بوونەوەی ئاینی مەسیحیەت دەگەرێتەوە بۆ چەند هۆیەک لەوانە (بوونی بۆشای رۆحی ، خراپی بارودۆخی ئاینی و کۆمەلایەتی و ئابوری ، بوونی پەیوەندی بازرگانی و ریگای باش لە نێو ئیمبراتۆریەتی رۆمادا ، بلاو بوونەوەی زمانی لاتینی کۆن لە نێو ئیمبراتۆردا ، پێداگری مەسیحیەکان لە بلاو کردنەوەی ئاینەکەیان و شوێن کەوتنی و هەروەها دانان بە ئاینی مەسیحی بە پێی مەرسومی میلان لە سالی ٣١٣ ز بە ئاینی رەسمی ئەو کاتە ...) و کتێبی ( ئنجیل ) هی مەسیحێکانە و باوەڕیان پێیەتی . (١٢)

پرۆفیسۆر ا . س . هۆدیت باس لە سێ تایبەت مەندی دەکات بۆ ئەوەی کە ئاینی مەسیحیەت بە سەرکەوتوی بمێنێتەوە :

١ – باوەڕی رەهای مەسیحبەکان بە ئاینەکەیان ، ٢ – جیا کردنەوەی خۆیان و ئاینەکەیان لە کەسانی تر کە یەک خوایان پەرستووە ، ٣ – سوربوون لەسەر ئەوەی کە لە خوا زیاتر هاوار بۆ کەس نەبەن . (١٣)

پاش ماوەیەک لە بلاو بوونەوەی ئاینی مەسیح کێشە لە نێو پەیڕەوکارانی ئەم ئاینەدا سەری هەلدا بە تایبەت لەسەر کێشەی ( سروشتی پەیوەندی

نێوان مەسیحی کوڕ و مەریەمی دایک و خودا ) ئەم کێشەیە دوو ئاراستەی وەرگرت یەکێکیان کە عیسای بە کوڕی خوا دەزانی ئەوی تریان بە جیا واتا ( خودا ) دروستکار و ( عیسا ) دروست کراو ، ئەمەیش سەری کێشا بۆ دروست بونی مەزهەبی ئاریۆسی لە رۆژهەلات و مەزهەبی ئەسناسیۆس لە رۆژئاوای ئیمبراتۆریەتی رۆمادا . (١٤)

**هەرچەندە حوکمەتی رۆمانی سیاسەتی لێبوردەی و نەرمونیانی بەرامبەر ئاینە جیاوازەکان هەبوو بەلام لە بەرامبەر بلاوبونەوەی ئاینی مەسیحیەتدا زۆر بە توندی وەستایەوە لەبەر چەند هۆیەک لەوانە :**

١ – زۆربەی مەسیحیە یەکەمینەکان لە شارە گەورەکاندا نیشتەجێ بوون و لە خەڵکی دابڕاوبون ، ٣ – نەپەرستنی ئیمبراتۆر کە مەسیحیەکان پەرستنیان بە بتپەرستێکی قێزەون دەزانی ئەمە لە کاتێکدا کە پەرستنی ئیمبراتۆر لە لە ئاینە کۆنەکاندا یەکێک بوو لە کۆڵەکەکانی دەسلات .

دوا بە دوای مەرسومی میلان ئاینی مەسیحەت لە هەڵکشان و داکشاندا بووە تا لە سەردەمی تیۆدسیۆسدا ئاینەکە بەرز کرایەوە بۆ ئاستی ئاینە فەرمیەکانی تری دەوڵەت ، بلاوبونەوەی مەسیحیەت لە ماوەی هەردوو سەدەی چوارم و پێنجەمدا و خێرا بلاو بوونەوەی ئاینی مەسیحی و دانانی سیستەمی " کەهەنوتی و پاپا و قەشەکان " چۆنیەتی درێژە دان بە کارو چالاکیەکانی مەسیحیەت پاش هەرەس هێنانی ئیمبراتۆریەتی رۆمانی لە سەدەمی پێنجەم و شوێن گرتنەوەی ئەو ئیمبراتۆریەتە لە ئەوروپا ، ئاینی مەسیحیەت توانی فراوانخوازی هەبێت لە رۆژهەلات و رۆژئاوای ئەوروپا پێ بە پێ بەلام ئەوە نابێت لە بیر بکرێت کە لە رۆژهەلاتدا بوونی دەسلاتێکی بەهێز وای کرد کە کەنیسە مل کەچی بێت بەلام لە رۆژئاوا بە پێچەوانەوە . (١٥)

کلێسای رۆما لە ماوەیەکی کەمدا بەرەو ئەوە چوو رۆڵی دەسلاتداری لە جیهانی مەسیحیدا بگرێتە دەست بە تایبەت دوو کەسی گرنگی دوای مەسیح

کە ئەوانیش ( بوترس ، پۆلس ) بوون ، دارمانی ئیمراتۆریەتی رۆمانی لە رۆژئاوا وای کرد کە کڵێسا تا رادەیەک سەربەخۆ بێت هەر چەندە لە رۆژهەڵات کڵێسا بە تەواوەتی لە ژێر دەستی پاپاکاندا بوو ، بەم شێوەیە کڵێسا و پاپاکان وورده وورده دەسڵاتی خۆیان سەپاند تا ئەو کاتەی کە دەوڵەتی تایبەتی خۆیان دامەزراند بە تایبەت لە ئیتالیا بەڵام ئەم هەماهەنگیە درێژەی نەکێشا و نێوانی دەسڵاتی پاشاکان و پاپا تێک چوو بە تایبەت لەسەردەمی ئیمبراتۆر هینری چوارەم ( ١٠٥٦ — ١١٠٦ ) ز بۆ رزگار بوون لەم قەیرانە لە سەدەی یانزەیەمدا لە ناو کڵێسادا بزوتنەوەی چاکسازی دەرکەوت کە بە بزوتنەوەی ( کلۆنی ) ناسرا ، پاپویەت لە سەدەی ١١ دا روبەروی بزووتنەوە ئاینیە چاکسازییەکان و ژمارەیەک لە قەوارەی سیاسی نەتەوەی بونەوە کە ئەمانەیش بونە بەربەست لە دەست وەردان لە وولاتانی ئەوروپی دا . (١٦)

سەر باری هەموو ئەو کێشانە ئەم ئاینە هەر لە سەرەتاوە تا ئەمڕۆیشی لەگەڵ بێت توشی چەندین گرفت و قەیران بووە یەک لەوانە هەرتەقە ( بیدعه ) یە کە زۆرێک لە ئاین و سیستەمەکان روبەڕووی دەبنەوە کە ئاینی مەسیحیەتیش بێ بەش نیە لەو گرفت و ئاریشانە ، مەسیحەت هەر لە سەرەتاوە توشی چەندین بزوتنەوەی لێ جیابووە بوو کە هەرتەقە یەک لەوانە مەبەستیش ئەوەیە کە ( دەرچونە لەو بیروباوەڕەی کە کەنیسە دانی پێدا ناوە ، یان دەرچونە لە بەشێک لەو بیرو باوەڕە ) بیروباوەڕی سالوس گرفتێک بو بە تایبەت ئەو پرسیارەی کە بەردەوام هەبوو لەسەر سروشت و کەسایەتی مەسیح و پەیوەندی بە باوکیەوە کە ئەو پرسیار گەلانە شتی زۆری دەوروژاند و مەسیحیەکانی کردە دوو بەرە و ئەمیش کۆنگرەی نیقییەی لە ساڵی ٣٢٥ بە دوای خۆیدا هێنا کە لەو کۆنگرەدا بە تەواوەتی ئەزەلیەتی مەسیح و یەکبوونی بە باوکیەوە پێناسە کرا و بە دوای ئەمیشدا چەندین کۆبوونەوەی پەیوەندیدار گرێ درا و کێشەی کەنیسەی کاسۆلیکی درێژەی

هـەبـوو بـە تایبـەت پـلـش ئـەوەی ( کـەمنۆفـستیەکـان ) لـە رۆژهـەڵاتـدا سەرکەوتنیان بە دەست هێنا لە بڵاو کردنەوەی بیروڕاکانیان . (١٧)
جەنگی خـاچ پـەرستـەکـان کـە ئـەوروپـای مـەسـیحی کردیانـە سـەر وولاتـە عەرەبیەکان لە دەی کۆتای سـەدەی ١١ دەسـتـی پـێ کـرد کـە نزیکـەی دوو سەد ساڵی خایاند ( ١٠٩٦ – ١٢٩١ ) زاینـی بـە بـەشـێک لـە مێـژووی ئـەم ئاینە دەزانرێت .

## پاڵنەکارەکانی جەنگی خاچ پەرستی:

١ پاڵنەری ئاینی : کەنیسەی خۆرئاوا بەردەوام شوێنکەوتوانی هـان دەدا بـۆ دژایەتی کردنی موسڵمانەکان و جـەنگانی لـەگـەڵیـان بـە ئـەرکێکـی پیـرۆز دەزانی کە ئەمەیش هانی مەسیحیەکانی دا کە لـەو جـەنگـەدا بـەشـدار بـن ، هاوکات ئەو هەموو دژواریانەی کە دەهاتە رێی ئەو حەجاجانـەی کـە دەهـاتن بـۆ خـاکی پیـرۆز لـە ( بیـت المقـدیس ) ئـەمـیش بـەهانـەی دا بـە دەسـت پاشاکانەوە بۆ جـەنـگ کـردن بـە تایبـەت پـاش ئـەوەی کـە سـەلجوقیـەکـان دەرکەوتن و بە توندی کەوتە گیانی حاجیە مەسیحیەکان .
٢ - پاڵنەرە ئابوری و بازرگانیەکان : تەماعی دەرەبەگە فەرەنسی و بازرگانە ئیتالیەکان کە ئاین بە لای ئەوانـەوە هۆیـەک بـوو بـۆ گـەیـشتن بـە مـەرامـە بازرگانی وسیاسیەکان و دەرەبەکە فەرەنسیەکان زەوی زۆریـان دەسـکەوت و بازرگانەکانیش بە هۆی بەشداریان قازانجی زۆریان دەست کەوت دەکرێـت بـە کورتی جەنگی خاج پەرستی بە جەنگێکی داگیرکاری ئەوروپی دژی جیهانی ئیسلامی بزانرێت . (١٨)

# ئەوروپا لەسەردەمی ریێنیسانسدا

ئەورووپای سەردەمی نوێ یان ڕێنیسانس چەندین هۆکاری ناوخۆی و دەرەکی بوو بە هۆی سەرهەڵدانی و ئەمەیش بوو بە هۆی لە دایک بوونی سەردەمێکی نوێ کە جیاواز بوو لە سەدەی کۆنی دەربەگایەتی و کڵێسای کاسۆلیکی و بۆ ئەم مەبەستەیش ڕێگەی ژیاندنەوەی کلتوری کۆنی یونانیان گرتەبەر و پێان وابوو بەم شێوەیە دەتوانن لەسەردەمی کۆن رزگاریان ببێت ، لەم روانگەیەوە ئەم ڕێبازە فکریە نوێیە سەری هەڵدا کە بە ڕێنیسانس (Renaissance ) کە بە زمانی فەرەنسی واتای ( ژیاندنەوە ) یان ( زیندوو کردنەوە ) دەدات و بە لای هەندێک مێژوونوسەوە سەردەمی مرۆڤایەتی رۆژگارێکی لەوە گرنگتری بەخۆوە نەبینەوە . (١٩)

ئەم سەردەمە دەکەوێتە نێوان هەر دوو قۆناغی مێژووی ناوەڕاست و نوێوە و بە سەردەمێکی زێرینی مێژووی ئەو کیشوەرە دادەنرێت و سەرەتاکانی دەرکەوتنشی بۆ سەرەتای سەدەی ١٦ دەگەڕێتەوە تا هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسی لە ساڵی ١٧٨٩ ز واتا ئەم سەردەمە سێ سەدەی خایاند (٢٠) ، هەڵبەتە کەسانێک هەن سەردەمی ڕێنیسانس بە سەدەی شانزەوە گرێ دەدەن بەڵام مەسەلەکە زۆر لەوە ئاڵۆز ترە لە راستیدا ڕێنیسانس لە نیوەی دووەمی سەدەی ١٤ ەوە دەست پێ دەکات تا سەرەتای سەدەی ١٧ واتا تا دەرکەوتنی دیکارت و شۆڕشی گالیلۆی ، بەڵام هەندێکی تر پێیان وایە کە ڕێنیسانس پێیەکی لە سەدەکانی ناوەڕستدا بووە و پێیەکی لە مۆدێرنەدا . (٢١)

لە سیما و دەسکەوتەکانی ڕێنیسانس لە ئەورووپا لە بواری بیردا بریتیە لە ( لێکۆڵیەوە لە مرۆڤ یان مرۆڤگەرایی ، دەرکەوتنی زمانی نوێ یان زمانی نەتەوەی ، سەرهەڵدانی چاپخانە کە خزمەتی زۆری بە بواری زانست و زانیاری کرد ، گرنگی دان بە زانستی مێژوو و شوێنەوار و هونەرە جوانەکان و دۆزینەوە جوگرافیەکان ... ) و هەروەرها لە بواری کۆمەڵایەتیدا بریتی بوو لە ( گرنگیدا بە چاکسازی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای زانیاری ئاینی ،

چاکسازی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای پشت نەبەست بە ئاین کە بە رێبازی ماکیافیلی ناسراوە ) و لە بواری سیاسیدا بیرۆکەی نوێ سەری هەڵدا کە لەسەر بیری هەر سێ زانا ( دانتی ، ماکیافیلی ، تۆماس مۆر ) بون . (٢٢)

نیکۆلا ماکیافیلی ( ١٤٦٩ – ١٥٢٧ ) ز ئەم سیاسەتمەدار و کەسایەتیە لە فلۆرنسای ئیتالیا لە دایک بووە ، ئەم سیاسەتمەدارە توانی کار لە رژێمی حوکم لە ئیتالیدا بکات و کاریگەری لەسەر رژێمی سیاسی هەبوو و توانی بە گژ واقیعی ئەو کاتەدا بچێتەوە و داهێنان بکات بۆ ئەو کات لە بواری رژێمی سیاسیدا . (٢٣)

سەرجەم لێکۆڵەران لەسەر ئەوە کۆکن مێژووی رێنیسانس بە پترارک ( ١٣٠٤ - ١٣٧٣ ) دەست پێ دەکات چونکە ئەوە ئەو کەسایەتیەیە کە زەمینەسازی بۆ بزوتنەوەی مرۆڤگەرایی و رێنیسانس دەکات و ناوبانگی پتراک بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شیعری بە زمانی ئیتالی نوسیوە نەک بە لاتینی کە تا ئەو کات زمانە لۆکاڵیەکان بە زمانێکی بازاڕی سەیر دەکران و ئەو کارەکتەرێکی بە پیتە و پڕە لە ناکۆکی لە لایەک دڵبەندی رابردووی بت پەرستی بووە لە لایەکی ترەوە وابەستەی ئێستای مەسیحیەتە ، پیتراک شیعرەکانی لە سەدەی ١٦ دا لە ئسپانیا و فەرەنسا بەدەر کەوت و دواتریش ئنگلتەرا و ئەڵمانیا .

یەکێک لە کۆڵەکەکانی دامەزراندنی رێنیسانس ریفۆرمی ئاینی بوو کە ئەم بزوتنەوەیە مەزهەبێکی نوێی بە ناوی ( پرۆتستانتی ) هێنایە ناو ئاینی مەسیحیە کە زیاتر پشت بە سەرمایەداری و ئابوری دەبەستێت و دەکرێت بە یەکێک لە دەسکەوتە هەرە گرنگەکانی ئەوروپای سەردەمی رێنیسانسی بزانین .(٢٤)

## بەشی دووەم

# مێژووی ریفۆرمی ئاینی لە ئەوروپا

**١ – ریفۆرم و ریفۆرمی ئاینی**
**٢ – زەمینەیەکی مێژووی ریفۆرمی ئاینی**
**٣ – هۆکارەکانی بەرپابونی بزوتنەوەی چاکسازی ئاینی**
**٤- دەرئەنجامەکانی چاکسازی ئاینی**
**- ژمارەیەک کەسایەتی کاریگەری چاکسازی ئاینی**
**مارتن لۆسەر**
**جان کاڵڤن**
**گەشەسەندنی چاکسازی ئاینی**

# مێژووی ریفۆرمی ئاینی لە ئەوروپا

**١ - ریفۆرم و ریفۆرمی ئاینی :**

ریفۆرم (reform) بە مانای کاری چارەسەریانەیە کە بۆ گۆڕینی هەندێک روکاری ژیانی ئابوری و کۆمەلایەتی و سیاسی ئەکرێ بە بێ ئەوەی گۆڕینێکی بنەڕەتی تەواو لە کۆمەڵدا دروست بکات ، ریفۆرم ئەو جۆرە گۆڕینەیە کە لە ناو چوار چێوەی رژێمی کۆمەلایەتی تێ ناپەڕێت و توانای هێزە سیاسیەکان تا رادەیەک نیشان دەدات ، ریفۆرم لە هەر کات و زەمەنێکدا بکرێت بەرهەمی خەباتی کۆمەلانی خەڵکە . (١)

چاکسازی ئاینی بزووتنەوەیەکی ئاینی بوو لە سەدەی ١٦ دا لە ئەوروپا سەری هەڵدا داوای چاکسازی لە کلێسا دەکرد هەروەها داوای دەکرد کلێسا خۆی لە جێ بەجێ کردنی هەموو سروت و رێورەسمێکی خراپ و هەڵە رزگار بکات ، ئەم بزوتنەوە ئاینیە لە ئەنجامی دەرکەوتنی ئەوەی پێی دەوترێت مەزهەبی پرۆتستانت * لە دایک بوو ، بە پێی هەندێک سەرچاوەی مێژووی سەرەتای چاکسازی ئاینی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مەلیکە ( ئەلیزابێسی یەکەم ) واتا سەردەمی شکسپیر و سەرەتای چاکسازی لە ئنگلتەرا بەلام ( مارتن لۆسەر )ی ئەڵمانی بە ریفۆرمخوازی ئاینی دەناسرێت بۆ ئەم مێژووە . (٢)

**٢ – زەمینەیەکی مێژووی چاکسازی ئاینی :**

یەکێک لە تایبەتمەندیەکانی سەدەکانی ناوەند ئەوە بوو کە فەیلەسوفەکان بۆ زۆر بیرو باوەڕ و دیاردەی سیاسی پشتیان بە کلێسا و پیاوانی مەسیحی دەبەست ئەمەیش بە هۆی ئەوەی کە نیشانی بدەن کە کلێسا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە بە تایبەت بە سەر دەسلاتی سیاسیەوە ، سەردەمی رینیسانس پاش ئەوەی لە هەوڵدا بوو بۆ جیاکردنەوەی سیاسەت لە ئاین و سەرەتای ئەم دەرکەوتنەیش بۆ سەدەی ١٦ دەگەڕێتەوە بۆ بزوتنەوەی

چاکسازی ئاینی و ئەمەیش بوو بە هۆی دابەش بوونی کڵێساکان و ئەم بزتنەوەیە وای کرد کە دەسڵاتی پاشا لەبەرامبەر کڵێسادا دامەزراوە تر و چاکتری بکات و بزوتنەوەی چاکسازی ئاینی توانی پاش ململانیەکی زۆر ئەم رەوشە لە بەرژەوەندی پاشاکان بە کۆتا بهێنێت و لێرە بەدواوە دەسڵاتێکی نەتەوایەتی جیا لە دەسڵاتی ئاینی دروست بوو ، بە مانایەکی تر ئەم بزتنەوەیە توانی دەسڵاتی ئاینی رۆحی کڵێسا بگۆڕێت بۆ دەسڵاتێکی دنیای بەم شێوەیە پاشایەتی نەتەوەی لە وڵاتانی ئەوروپا بەتایبەت لە ئەڵمانیا توانی خۆی بگرێت و شوێنکەوتوانی ئەو ئاینە بۆ هەر دوو بەشی مەزهەبی ئاینی مەسیحی لە ئەوروپا دابەش بوون . (٣)

بە درێژای سەدەکانی ناوەڕاست دەرەبەگایەتی وەک سیستەمێکی ئابوری — سیاسی پشت بەستوو بوو بە دام و دەزگای ئاینی و ئەم دەزگایە شەرعیەتی دەدا بە هەموو ئەو رێسا و یاسایانە کە دەرەبەگایەتی بەرهەمی هێنا بوون و ئەمەیش وای لە بیرمەندان کرد کە بیرێک لە سیستەمی سیاسی بکەنەوە و لەم رێگەیەوە فکری هۆمانیستی ( مرۆڤگەرایی ) ئەو سەردەمە پەردەی لەسەر روخساری دزێوەی کڵێسا هەڵمالی و کردیە یەکێک لە ئامانجەکانی ، بیروڕای مرۆڤگەرای سەبارەت بە ژیانی مرۆڤ تەواو پێچەوانەی بیروڕای ئاینی بوو هەر ئەمەیش زەمینەی بۆ بزتنەوەی چاکسازی ئاینی خۆش کرد . (٤)

بزوتنەوەی چاکسازی ئاینی reformation بزوتنەوەیەکی ئاینی بوو کە لە ئەوروپا سەری هەڵدا لە سەدەی ١٦ دا بۆ چاکسازی لە کەنیسە و کاروبارە خراپەکانی هەر چەندە لە سەدەکانی پێشوودا هەوڵ هەبووە لەم رووە بەڵام پاش دروست بوونی ئەم بزتنەوەیە کەنیسەی مەسیحی بە تەواوەتی دابەش بوو و وە کەنیسەی پرۆتستانت بە تەواوەتی سەر بەم بزوتنەوەیە بوو بە تایبەت لە ئەڵمانیا ، گەر بۆ مێژوو بگەڕێینەوە چەند هەوڵێک دەبینرێت بۆ چاکسازی وە یەکەمین هەوڵ دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی

٣١٣ ز کـە قـەشـە قوسـتەنتینـی گـەورە **  ( ٢٧٤ – ٣٣٧ ) ز پـاش مەرسومی میلان ئازادی بەم ئاینە دا لە چوارچێوەی دەوڵەتدا و بوو بە هۆی ئەوەی کە بە باشی ئـەم ئاینـە بناسـرێت و هـەر دوو مـەزهـەبـی ئاریۆسـی و ئەسناسیۆسی ڕێک خست . (٥)

بێگومـان شۆڕشـی چاکسازی ئـاینی ڕوداوێکـی گرنگـە لـە مێـژووی نـوێی ئەورووپادا و ئەم شۆڕشە وەک ووتمان کوتـوپڕ سـەری هـەڵنـەدا و پێشینەی هەبوو بۆ ڕزگار بوون لە کۆت و بەنـدەکـانی کـەنیسە هـەر چـەنـدە کڵێسای کاسۆلیسکی بەرهەڵستی دەکـرد بـەڵام نـەیتـوانی لـە ڕیشە دەریـان بکـات و پاش گۆڕنکاریەکان و دەرکەوتنی هەندێک بیرمەنـد توانیـان دژی کـەنیـسە و کەللە ڕەقیەکانی بوەستنەوە هەر چەندە کـەنیـسە ئـەمانـەی بـە بـێ بـاوەڕ و کافر دایە قەڵەم و تەنانەت بڕیاری مەرگیشی بەسەریاندا سەپانـد بـەڵام ئـەم جوڵانەیەوەیە لە سەرەتای سەدەی شـانزەیـەمـدا تـەقیـەوە کـە جموجـوڵێکی رامیـاری کۆمـەڵایـەتـی شۆڕشـگێڕانە بـوو وە بـەشـێکی فراوانـی ئـەورووپـای گرتەوە . (٦)

بە درێژای سەدەی ١٦ و ١٧ مەسیحیەکان بـە نـاوی خـواوە دژی یـەکتـر لـە شەڕدا بوون و ئەم خـوێن ڕشـتنە لـە ئـەنجامـدا دەسـڵاتی ئـاینی مـەزهـەبـی کاسۆلیکی کەم کردەوە بەڵام زۆربـەری مـەسـیحیەکـان لـە هـەر دوو مـەزهـەب نیگەران بوون ، چەندین پرسیار لەو دەمەدا سەری دەرهێنا وەک کـام ڕێبـەر و بانگەشەکار باوەڕی ڕاستەقینەی لایە ، ڕاڤەی کام لەوانە بۆ کتێبـی پیـرۆز دروست و ڕاستە ئوم پرسیارانە کە لە لایەن بیرمەندان و تـەنانـەت خـەڵکی ڕەش و ڕوتەوە دەکرا پێویستی بە وەڵامی جدی و کۆتا هەبوو . (٧)

هەندێکی تر بەم بزوتنەوەیە دەڵێن چاکسازی پرۆتستانتی کە بزوتنەوەیەکی چاکسازی بوو لە سەدەی ١٦ دا کـە ئامـانجی چاکسازی بـوو لـە کـەنیسـەی کاسـۆلیکی لـە ئـەورووپـای ڕۆژئـاوا بڵاوبویـەوە لـە نێـو  چینێکـی فراوانـی مـەسـیحیەکـان کـە بێـزار بوبـون لـە کـەنیـسە و پیـاوانی ئـاینی بـە تایبـەت

فرۆشتنی کارتی لێخۆشبون (صکوک الغفران) کە ئەم کڕین و فرۆشتنەیش بۆ خزمەتی پیاوانی ئاینی و پاپاکان بوو . (٨)

# ٣ – هۆکارەکانی بەرپابونی بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی :

بزوتنەوە چاکسازی ئاینی بەگەڵیک قوناغدا تێپەڕ بووە و هۆکار گەلێکی زۆر لە پشتی هەڵیرسانیەوە بووە لەوانە هۆکاری ئاینی و سیاسی و رۆشنبیری و ئابوری کە هۆکاری ئاینی لە هەمویان زیاتر کاریگەر تر بووە ، سەرهەڵدانی بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی بە گشتی بۆ ساڵی ١٥١٧ ز دەگەڕێتەوە کاتێک کە مارتن لۆسەر بەبەیاننامەکەی خۆی بە ٩٥ بەند لە کڵێسای شاری ویتێنبرگ لە ئەڵمانیا دارشت ئەمە داینەمۆی سەرەکی پشت ئەو بزوتنەوەیە بوو (٩) ، **دەکرێت لێرەدا ئاماژە بە چەند هۆکارێکی پشت ریفۆرمی ئاینی لە ئەوروپا بدەین :**

١ – خراپی کەنیسەی کاسۆلیکی و پیاوەکانی پاڵنەرێکی بنەڕەتی بوون بۆ تەقینەوەی شۆڕشی چاکسازی ئاینی ، وەک زانراوە کە کەنیسە دەستی بەسەر ئەقڵ و هۆشی خەڵکی بە تایبەت داهێنەر و زاناکاندا گرتبوو وە هەندێک لەو کەسانەی لە ( دادگاکانی پشکنین ) *** دا بڕیاری مەرگ بەسەریاندا درابوو ، ژمارەیەک لە پیاوانی کڵێسا دوور لە ژیانی ئاینی دەژیان و بە لای دەربەگایەتیدا لایان دابوو وە هەندێکی تر بە سکەکانی لێخۆش( ×کوک غفران ) بوونەوە بازرگانیان دەکرد و هەندێکی تریان دەستیان بەسەر ژمارەیەکی زۆر لە زەوی و زاردا گرتبوو وە ئەمان نەیاندەهێشت کەس کتێبی پیرۆز بخوێنێتەوە بە بێ سەرپەرشتیارێک بەم شێوە دەستیان بەسەر بیر و ئەقڵی خەڵکیدا گرتبوو . (١٠)

٢ – سەرهەڵدانی ژمارەیەک لە هەڵسوڕێنەری چاکسازی و بانگێشتی راست گۆیانەیان بۆ چاکسازی لە بارودۆخی کەنیسە و پاپاکان و گەڕانەوە بۆ بنەما

پوختەکانی مەسیحیەت و دورکەوتنەوە لە چێژە دونیاکان کە دیار ترینی ئەوانەیش بریتی بوو لە ( جۆن ویکلیفی ئنگلیزی و جۆن هوسی ئیتالی ) . (١١)

٣ – سەر هەڵدانی بزتنەوەی ڕێنیسانسی زانستی و روشنبیری لە کۆتای سەدەی ١٤ و سەرەتای سەدەی ١٥ دا لە ئیتالیا ئەمەیش وای کرد لێکۆڵینەوە زیاتر بە زمانی لۆکاڵی بکرێت نەک لاتینی و ئەمەیش بوو بە هۆی تێگەیشتنی خەڵکی سادە لە نوسینەکان و ئەمەیش بوو بە هۆی گفتوگۆی نێوان پیاوانی ئاینی و داناکان و تێگەیشتنی زیاتر لە ئاین

٤– دەرکەوتنی چاپ و پیتی چاپ لە ناوەڕاستی سەدەی ١٥ دا ئەمەیش بوو بە هۆی لە چاپدانی چەندەها کتێب بە زمانی لۆکاڵی بە تایبەت کتێبی پیرۆز پاش ئەوە وەرگێڕدرایە سەر زمانەکانی تر .

٥– دەرکەوتنی مەیلی نەتەوایەتی هۆکارێک بوو بۆ بەرەو پێشەوە چونی ئەم بزوتنەوەیە ، پاشا و شازادە لۆکاڵیەکان هەوڵیان دەدا دەسڵاتی خۆیان زیاتر بکەن بۆ ئەوەی دارایی و چەکداری تایبەت بە خۆیان هەبێت تەنانەت مارتن لۆسەر نەیتوانی ئەم مەیلەی خۆی بشارێتەوە کاتێک رۆمای بەوە تۆمەتبار کرد کە سەروەت و سامانی ئەڵمانیا بە تاڵان دەبات .

٦– خراپی بارودۆخی جوتیارەکان لە کار کردنی زۆر لە زەویەکانیاندا بۆ ئەوەی داواکاری خاوەن زەوی و دەرەبەگەکان جێ بە جێ بکەن و هەموو ئەو جوتیارانە دەرفەتیان دەبینی لە چاکسازی ئاینی بۆ رزگار بوون لەو دۆخەدا . (١٢)

٧ – لابردن و زیاد کردنی چەندین دەقی ئاینی بۆ ئنجیل لە لایەن قەشە و ئوسقوف و پاپاکان لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان ، بڵاوبونەوەی بەد رەوشتی و داوێن پیسی پیاوانی کەنیسە لەگەڵ ئافرەتە رەبەنەکان و خەڵکی تردا .

٨- دەست خستنە ناو کاروباری خێزان و کۆمەڵگە و دەزگا دەوڵەتیەکان لە لایەن پاپا و پیاوانی کەنیسەوە و شەڕی بەردەوامی نێوان خێزان و کۆمەڵ و دەزگانی دەوڵەت کە بە پلانی کەنیسە دروست بوو بوو .

٩ - بڕیار دانی نادروست و دەرکردنی فرمانی ئاینی لە لایەن پاپا و گەورە قەشەکانی مەسیحی بۆ مەرامی تایبەت و هەڵویستی سیاسی و دەسکەوتی ئابوری تایبەت بە خۆیان . (١٣)

١٠ - شکستی جەنگی خاچپەرستەکان لە هەشت هەڵمەتی شەڕی دوو سەدساڵەدا کە بیروباوەڕی حەڵکی سەبارەت بە کڵێسا لاواز و سست کرد ئەمە سەرەڕای درۆی پاپاکان لە سەرکەوتنی بەسەر مۆسڵمانانی دژمنیاندا ، ئاشنابونی خاچپەرستەکان بە ئاینی ئیسلام و رۆژهەلات و نەبونی قەیرانی ئابوری و توندی ئاینی و ئاشنابون بە تایبەت نەرم و نیانی لە ئاینی ئیسلامدا ئەمەیش وای کرد کە بیرمەندان و کەسایەتیەکان بیر لە بیروباوەڕی کڵێسا بکەنەوە و پێداچونەوەی تێدا بکەن و پشت لە کڵێسا بکەن . (١٤)

١١ - هارۆڵد جەی گێمی مێژوونوس دەڵێت لەسەر دەمی چاکسازیدا دەریاوانە ئەوروپیەکان بە گەشتەکانیان بە دەوری زەویدا سوڕانەوە و گەشتیان کرد بۆ هند و رۆژهەلاتی دوور و کیشوەری ئەفەریقا ، دوو کیشوەری گەورەی ئەمەریکای باکور و باشوریان دۆزیەوە و گەشتیان کرد و رێگەی نوێی بازرگانیان دۆزیەوە و ئەشنای جیهانی نوێ تر بوون ، هەموو ئەمانە وای کرد کە خەڵکی جارێکی تر پەیوەندی خۆیان لەگەڵ کڵێسا و خوادا هەڵسەنگێننەوە هەروەها زیاد بوونی داواکاری بۆ بازرگانی کەل و پەلی بیانی ئەمەیش بوو بە هۆی پێک هێنانی چینی نوێی بازرگانی . (١٥)

١٢ - گۆڕانکاری خێرا لە هەندێک نەریت و رەسمی کۆن تایبەت بە ئاین کە ئەمەیش وای کرد کە چاکەخوازەکان لیی دور بکەونەوە و دەستی لێ

هەڵبگرن ، هێزی توند و یەقین بۆ خوێندنەوەی ئنجیل و باوەڕ بەوە هێنرا کە هێزی ئاینی یەکە یەکە توانای رزگار کردنی مرۆڤی هەیە نەوەکو کەسێک یان بزوتنەوەیەک .

١٤ – زیاد کردنی چەند کۆت و بەندێکی ئاینی لە لایەن زانایانی لاهوتی وای کرد بوو کە پیناسەی زیاتر بۆ دقەکان بکرێت و بێ سنوری بێت ، هاوکات بڵابونەوەی بیری کۆن وای کرد لە ئیتالیادا تەشەنە بکات و پیی وابوو کە پاپاکان جگە لە پارە هیچ مەبەستێکی تریان نیە و بە سوک سەیری ئەڵمانیەکان دەکەن . (١٦)

**٤ – دەر ئەنجامەکانی چاکسازی ئاینی :**

پرۆفیسۆر ( پاتریک کۆڵینسۆن ) کە مامۆستای زانکۆیە لە کامبردج لە بەریتانیا پێی وایە ئەو ریفۆرمە ئاینیەی لە سەدەی ١٦ رویدا چرکە ساتێکی گرنگە بۆ هەموو ئەوروپا چونکە ئەم ریفۆرمە بوو توانی ناسنامەی ئەوروپای مۆدێرن دیاری بکات کاتێک کۆتای بە دەسڵاتی کاسۆلیکی هێنا . (١٧)

لێرەدا دەکرێت بە چەند خاڵێک دەر ئەنجامەکانی (دەسکەوتەکان) بزوتنەوەی چاکسازی ئاینی رون بکەینەوە :

١ - بزوتنەوەی چاکسازی ئاینی لە رووی فکری و کرداریەوە پشتی پاشایان گرت و دژی پاپا بوون واتا دەسڵاتیان لە دەسڵاتی روکەشی کڵێسا دەر هێنا و کردیانە دەسڵاتێکی یەزدانی ، ئەم بزوتنەوەیە زەمینەی خۆشکرد بۆ ئازادی تاکە کەس و هێنانە کایەی حوکمی دیموکراسی .

٢ – پاش سەرکەوتنی ئەم بزوتنەوەیە لە ژمارەیە وڵاتی ئەوروپی بەڵام لە ژمارەیەک وڵات پشێوی و نا ئارامی بە دوای خۆیدا هێنا ئەمەیش بوو بە هۆی کوشتنی ژمارەیەک خەڵکی و هەر ئەمەیش وای کرد کە بیر لە پێکەوە ژیانی ئاینی بکرێتەوە لە سایەی یەک دەسڵات و لە چوار چێوەی یەک دەوڵەتدا . (١٨)

٣ – دەر کەوتنی چەندین کەسایەتی ریفۆرم خواز لەوانە ( مارتن لۆسەر ، جان کالڤن و جان هوس ... ) کە کاریگەری زۆریان لەسەر کۆمەڵگەی مەسیحی هەبوو ، ئەمانە بڕوایان وا بوو کە ٍدەبێت کەنیسە رزگار بکرێت لەو کەندەڵیەی کە تێی کەوتووە .
٤ – زۆرێک لە چاکە خوازەکان لە ئاینی مەسیحی کە پێشتر کاسۆلیکی بوون بوون بە پرۆتستانت و بە مەیش لە ئاینی مەسیحیدا دوو مەزهەب دروست بوو ، لە ساڵی ١٥٢٩ ز لە ئەڵمانیا لە نێوان حوکمڕانگەلێک کە پیشتیوانیان لە ئیمبراتۆریەتی پیرۆزی رۆما و کەنیسەی کاسۆلیک دەکرد و ئەوانەی کە پشتیوانی چاکسازی بوون دابەش بوون کە پرۆتستانت ( ناڕازی ) بون کە دژی کەنیسەی کاسۆلیک وەستانەوە . (١٩)
٥ – پاش کۆتای هاتنی دەسڵاتی کڵێسا دەرگا ئاوالا بوو لە بەردەم دروست بوونی نەتەوەی نوێ لە ئەڵمانیا و ئنگلتەرا و فەرەنسا ... کە پێشتر هەموو میللەتانی ئەوروپا سەر بە جیهانی مەسیحی بوون .
٦ – دروست بونی هەستی نەتەوایەتی لە لای میللەتان بۆ نمونە پاش بزوتنەوەی چاکسازی ئەڵمانەکان پێش ئەوەی هەست بکەن مەسیحین هەستیان دەکرد ئەڵمانین کە ئەم هەستەیش لە لایەن ( مارتن لۆسەر ) ەوە لە لایان دروست کرا .
٦ – کتێبی پیرۆز لە لایەن مارتن لۆسەرەوە بۆ زمانی لۆکاڵی بە تایبەت ئەڵمانی وەرگێڕدرا کە پێشتر تەنها بە زمانی لاتینی دەخوێنرایەوە و ئەو زمانانە بە بازاڕی سەیر دەکران و بەمەیش لۆسەر توانی هەستی ناسۆنالیزمی ئەڵمانی بنیاد بنێت .
٧ – بزوتنەوەی چاکسازی ئاینی یاسایەکی تۆکمەی کڵێسای تێک شکاند ئەویش رەهبانیەتی پیاوی ئاینی بوو ، پاش ئەوەی مارتن لۆسەر ژنێکی قەشەنگی خواست توانی ئەوە بڵێت کە خوا نەیوتوە ناتوانن تا کۆتای ژیان

ژن نەهێنن ،بەم جۆرە ژن هێنان لە مەزهەبی پرۆتستانتدا بوو بە شەرعی هەر چەندە تا ئێستایش لە کاسۆلیکیدا قەدەغەیە . (٢٠)
٨ — لە رووی ئابوریەوە ئەم بزوتنەوەیە بەرەو پێشەوە چوو ئەویش کە لە کاتێکدا کڵێسای کاسۆلیکی سود ( الربا ) ی حەرام کردووە بەڵام بزوتنەوەی چاکسازی ئاینی شەرعیەتی پێ دا بەمەیش بازرگانی گەشەی کرد و چینی ناوەڕاست توانی خۆی بسەلمێنێت و بازاڕی یەکگرتوو پەیدا بێت وە کاری پیشەی پەرەی سەند ، پێشتر ئابوری دەرەبەگایەتی پەیڕەو دەکرا بەڵام لە جێگەی ئەو سیستەمی دراو داهێنرا . (٢١)
٩ — بەر پابوونی جەنگێکی خوێناوی دوو سەد ساڵە لە نێوان هەر دوو مەزهەبدا کە سەدان هەزار کەسی کردە قوربانی ، ئەم جەنگە لە نێوان سالآنی ١٥٦٢ — ١٥٩٨ ز لە فەرەنسا تاوی سەند و گەیشتە ئەوپەڕی بە تایبەت لە قەسابخانەکەی ( سانت بارتیلمی ) کە لە سێ رۆژدا پێنج هەزار کەسی تێدا کوژرا و ژمارەیەک لە خەڵکی وولآتیان بەجێ هێشت ، ئەمەیش وای کرد کە دەمارگیری توندی لە هەردوو لا دژی یەکتر هەبێت و هەر لەو دەمەدا بڕیاری قەدەغە کردنی چەندین کتێبی نوسەران وەک لۆسەر و ئیراسمۆس درا و سوتێنران . (٢٢)
١٠ — لە سەدەی ١٦ دا ژنان زیاتر پەیوەست بوون بە پێگەی کۆمەڵایەتەیەوە و هەر چەندە لۆسەر خێزانی پێک هێنا بەڵام بڕوای وا بوو کە ژنان ناتوانن کاری قەشەی بکەن بەڵام ژنان لەم شۆڕشەدا رۆڵی گرنگیان گێڕا بە تایبەت ژنێکی وەک ( مارگرێت دۆ ئانگۆل ) کە خوشکی پاپا فرانسۆی یەکەم پرۆتستانت بوو نوسینکەکانی کاریگەری زۆریان هەبوو بەڵام پاشتر ژنان توشی توندوتیژی بون و ئەم بزوتنەوەیە بە جدی نەیتوانی ژن کارا بکات بە تایبەت بۆ رێورەسمە ئاینیەکان .
١١ — بوارەکانی کلتور و زانست لە سەردەمی چاکسازیدا پێشکەوت و قوتابخانەکان شوێنی فێرکاری قەشەکانیان گرتەوە و زۆربەی قوتابخانەکان

کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی خەڵکانی مەدەنـی ، زانـستیش پێشکەوت بـە تایبـەت کاتێـک کـە کۆپـەرنیـک سـەلمانـدی زەوی بـە دەوری خـۆردا دەسـوڕێتەوە ، هاوکات هونەر و مۆسیقا پاش بوونی بۆچونی زۆر تا رادەیەک گەشەیان کـرد بە تایبـەت کاتێـک کـە لۆسـەر و هاوڕێکانی لـە ١٥٢٤ ز یـەکـەمـین سـرودی مەهەبی پرۆتستانتیان بەرهەم هێنا . (٢٣)

١٢ – ئەزمونەکانی شەڕی ئاینی پێویستی بوونی دەرکـەوتنـی سیـستەمێکـی نوێی بە ناوی عەلمانیەت هێنایە ئارا تا بوار بە پیاوانی ئاینی نەدرێت شەڕی ناوخۆ و ململانیەی ئاینی بهێننە ئاراوە و بۆ ئەمەیش سامانی وڵات بـە فیـڕۆ بدەن .

١٣ – یارمەتی دەرخستنی تواناکانی دا بواریـان بـۆ رەخـسا بـۆ ئـەوەی بـە ویـست و ئـارەزووی خۆیـان بیـر بکـەنـەوە و کـار بـۆ خزمـەت کردنـی کۆمەڵکەگەیان بکەن و بەرەو پێشی ببەن . (٢٤)

# ژمارەیەک کەسایەتی کاریگەری چاکسازی ئاینی

لـە مێـژووی بزوتنـەوەی چاکـسازی ئـاینی لـە سـەدەی ١٦ دا ژمـارەیـەک کەسایەتی ناوی دێت کە رۆڵ و نەخشی تایبەتیان هەبووە لێرەدا بە کورت و پوختی تیشک دەخەینە سەر ژیان و کاریگەری ژمارەیەکیان ، دوو کەس لە چاکەخوازەکانی بەر لە سەردەمی چاکسازی هەن کە پێویستە ئاماژەیان پـێ بدرێت کە یەک لەوانە کەسێکی بـەریتانیـە بـە نـاوی ( جـان ویکلیـف ) کـە مامۆستای ئۆکسفۆرد بووە ئەو بڕوای وا بوو کە سـەردەمـی رسـوای پاپاکـان بەسەر چووە و هەر کاتێک ئەوان گەڕانەوە بـۆ پـەیـڕەوی مـەسـیح پێویـستە خەڵکی گوێیان لێ بگرن ، ئەو بـڕوای وا بـوو کـە پێویـستە کـەنیـسە رزگـار بکرێت لە دارایی و دەسڵاتی خۆی ، ئەو بڕوای وا بـوو کـە پێویـستە ئنجیـل وەربگێردرێتە سەر زمانی تر هەروەها لە کاتی مەراسیمی ( عشا ربانی ) کە

قەشەکان نان و شەراب بۆ لاشە و خوێنی مەسیح دەگۆڕێت و ئەو بڕوای وا بوو ئەمە وانیە و بۆچونەکانی ئەو پاش ١٥٠ ساڵ لە بزوتنەوەی چاکسازیدا رۆڵیان هەبوو . (٢٥)

جان ویکلیف یەکەم کەس بوو کە دژایەتی دەزگای خاچپەرستی کرد و خوازیار بوو کە موڵک و دارایی کڵێسە لە نێوان هەژاراندا دابەش بکرێت ، لە ساڵی ١٣٧٧ ز نەیارانی ویکلیف داوایان لە پاپا کرد کە فەرمانی دەست گیر کردنی بدەن بەڵام پاش مردنی پاپا گریگۆری یازدەیەم ئەو کارە دواکەوت و پاشان خۆی و نەیارەکانی کەوتنە بەر هەڕەشە و مەترسی و تەنانەت هەندێکیان سوتاندن و پاش کۆچی جان ویکلیف لە ساڵی ١٣٨٤ کۆچی دوای کرد و یەک لە شوێن کەوتوانی درێژەی بە رێبازەکەی دا ئەویش ( جان هوس ) بوو . (٢٦)

جان هوس ( ١٣٧٠ – ١٤١٥ ) ز دووەمین گەورە نوێنەری ریفۆرم کە لە سەرەتای سەدەی ١٥ ەوە لە زانکۆی پراگ لە چیک پەروەردەی رێبازی ویکلیف کەوتە رەخنە گرتن لە گەندەڵی کڵێسا و چەکەکانی لێ خۆشبون ، ئەم زانایە تەنها خەباتکاری ئاینی نەبوو بەڵکو دژایەتی دەسڵاتی ئەڵمانیای کردووە کە وولاتەکەی داگیر کردووە کە دوژمنی وڵاتەکەی بووە و ئەو بەرامبەر قەشە تاوانکارەکان دەیوت " پاپایەک لە پلە و پایەی خۆیدا توشی کردار و رەفتاری خراپ ببێت ئەوا نوێنەری شەیتانە " ، جان هوس لە ساڵی ١٤١٤ ز لە لایەن کەنیسەوە بانگێشت کرا تا لە گوناهەکانی پاشگەز بێتەوە پاش ئەوەی بەڵێنی پێ درا نەسوتێنرێت بەڵام لە ٦ ی یۆلیۆی ١٤١٥ وەک بێ باوەڕ لە ئاگردا سوتێنرا .(٢٧)

جگە لەو کەسایەتیە بەرایانە ناوی چەند کەسایەتیەکی تر لە چاکسازی ئاینیدا دێت لەوانە ( ئۆدولف ئەکریکۆلای ئەڵمانی ، ئەرزمی هۆڵەندی ) وەک چاکەسازی ئاینی مەسیحی و کەنیسەی کاسۆلیکی دەرکەوتن بەڵام وەک پێویست هەوڵەکانیان سەرکەوتوو نەبوو تا ئەو کاتەی ژمارەیەک

چاكسازی ئاینی لە سەدەی ١٦ دا دەركەوتن كە رۆڵی گەورە و كاریگەریان لەم بوارەدا بینی . (٢٨)

**مارتن لۆسەر ( ١٤٨٣ – ١٥٤٦ ) ز**

مارتن لۆسەر Martin luther روناكبیر و چاكسازی ئاینی و خاوەن بیری بلیمەتی ئەڵمانی كە قەشەیەكی دەست پاك و رەوشت بەرز و دلێر و خۆشەویست بوو ، هاوكات توندڕەو بوو بە تایبەت نمونەی رەوشتی ووشكی جوتیارانی ئەو وولاتە رەنگی دابووە لەسەری ، ئەم زانایە لە سەكسۆنیای ئەڵمانیا لە دایك بووە و پاشان توانی لە زانكۆی ئەرفورت قانون بخوێنێت . (٢٩)

لۆسەر لە ساڵی ١٥٠٤ دكتۆری لە ئاداب لە هەمان زانكۆ بە دەست هێنا و بۆ ماوەیەك خۆی بە ووتنەوەی زانست و رەوشت و زانستە سروشتیەكانەوە خەریك كرد ، پاش ئەوەی حەزی بە خوێندنی زانستی لاهوتی ( زانستە ئاینیەكانی مەسیحی ) كرد روو لە یەكێك لە دێرەكان كرد و لە ساڵی ١٥٠٧ لوسەر بوو بە قەشەیەكی سەركەوتوو لە كاتێكدا ئەمە دژی خواستی باوكی بوو كە حەزی دەكرد كوڕەكەی ببێتە پارێزەر ، پاش ئەوەی لە ساڵی ١٥١٠ ز سەردانی رومای كرد بە چاوی خۆی گەندەڵیەكانی كڵێسای كاسۆلیكی بینی بە تایبەت فرۆشتنی سەكەكانی لێخوشبوون ( ×كوك الغفران ) و پاش گەڕانەوەی بۆ ئەڵمانیا رەخنەی توندی ئاراستەی ئەم كارە كرد و ئەمەیشی لە لە شێوەی ( ٩٥ ) بەندا بە دەرگای كڵێسای وێتێنبرگدا لە ساڵی ١٥١٧ ز دا هەڵواسی و ئەم رەفتارانەی رسوا كرد . (٣٠)

سەرەتای دەركەوتنی ئەم پیاوە پێش ئەم هەڵوێستەی بوو بە تایبەت ئەو كاتەی كە وەك پاڵەوانێكی میللی دەركەوت كە نارەزای خۆی لە كۆكردنەوەی كڵێسای ئەڵمانی بۆ باج و سەروەت و سامانی ئەو وولاتە ئەوانە كردنی بۆ روما و پاپای بەوە تۆمەتبار كرد كە ئاین بۆ مەبەستی شەخستی بەكار دێنێت و ئەمەیش وای كرد كە گەلی ئەڵمانی لە خەوی قوڵ

راپەڕێنێت و هـەسـت بـە شوناسـی خۆیـان بكـەن و بـەم شـێوە ئـەو پـارە و سامانەی كە پێشتر بۆ جێگەیەكی تر دەچوو ئیتر لە خزمـەتـی ئـەڵمانـەكـان خۆیاندا بەكار دەهات و مارتن لۆسەر سەبارەت بـە كـارەتـەكـانی لێخۆشـبون ئـەوەیـشی ووت كـە " ئـەو لێبوردنـەی پاپـا دەری دەكـات ناتوانێـت هـیچ گوناهێک بسڕێتەوە " . (٣١)

لێرە بە دواوە لۆسەر بزاڤە چاكسازیەكی بنیاد نا و دەسـتی كـرد بـە رەخنـە گرتن لە كلێسا و لەماوەیەكی كەمدا شوێنكەوتوی زۆر بـوو لـە ئـەڵمانیـادا ، هەر لەو دەمەدا لۆسەر رونی كردەوە ئەو فەرمانە یەزدانیانەی كە لە ئنجیلـدا هاتون زۆر جودان لەوانەی كە كلێسا پـەیـڕەویـان دەكـات و ئـەوانـەی ئـەوان هـەڵبـەسـتراوی مـرۆڤن ئـەمـەیـش وای كـرد كـە ئیمراتـۆر كـارلی پێنجـەم هەڵویستی لەمەر لۆسەر و بزاڤەكـەی هـەڵگـرت بـەڵام ئـەم بزوتنـەوەیـە هـەر بەردەوام بوو لەسەر كارەكەی خۆی .

ئەم بزوتنەوەیە كە گەشەی كرد زۆربەی ئەڵمانیای گرتەوە و ئـەمـەیـش وای كرد كە كەنیسەی كاسۆلیكی هەندێک چاكسازی بكات و سەرئـەنجـام كلێـسا بـۆ هــەر دوو بــەشــی كاسـۆلیكی ( پاپــا ) و پرۆتــستانتی ( ئنجیلــی = ریفۆرم ) دابـەش بـوون ، لـە سـاڵی ١٥٢١ ز لۆسـەر لـە لایـەن ئیمبراتـۆرەوە دەست بەسەر كرا بەڵام پاشتر توانرا ئازاد بكرێت و هەڵبێت بۆ قەڵایـەک لـە ناوچەیەكی دوور و لەوێ ئینجیلی بۆ سەر زمـانی ئـەڵمـانی وەر گێـڕا ، ئـەم زمانەی كە ئەم ئینجیلی پێ وەرگێڕدرا زمانی سادەی خەڵک بـوو دواتـر بـوو بە زمانی شاعیران و ئەدیبان و زمانی یەكگرتووی ئەڵمانی . (٣٢)

مارتن لۆسەر بلیمەت و كەسایەتـی ئـاینی و ریفۆرمخـوازی ئـەڵمـانی كـە لـە لایەن لێكۆڵەرانەوە جێگەی پرسیار و بۆچـونی جودایـە و هـەنـدێک جـار چەند رەخنەیەكی لێ دەگیرێت بە تایبەتی كە نەیتوانی پشتیوانی شۆڕشـی جوتیاران بكات و بۆچونەكانی

سەبارەت بە ژنان کە ناتوانن ببن بە قەشە و بەرپابوونی شەڕی ئاینی کە زۆربەی ئەوروپای گرتەوە و بوو بە هۆی کوشتنی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ... (٣٣)
ئەم بزوتنەوەیە لە ئەڵمانیادا خەڵکی کردە دوو بەشەوە بەشێکی لەگەڵی بوون وە بەشێکی دژی بوون ئەمەیش بوو بە هۆی شەڕێکی خوێناوی سی ساڵە بەرپا بوو کە زۆربەی ئەڵمانیا و ئەوروپای گرتەوە و ئەو شەڕە لە ساڵی ١٥٤٦ کۆتای هات ٢ .
دەتوانین بۆچونەکانی مارتن لۆسەر بۆ چەند خاڵێک کورت بکەینەوە لەوانە ( دورکەوتنەوەی پیاوانی ئاینی لە دەسەڵاتی مەدەنی ، رێگەدان بە هاوسەرگیری پیاوانی ئاینی ئەویش پاش ئەوەی کە خۆی لەگەڵ یەکێک لە خزمەتکارانی کەنیسە زەواجی کرد ، تەنها پاپاکان نەتوانن ئنجیل تەفسیر بکەن واتا هەموو کەس ئەو مافەی هەبێت ... ) . (٣٤)
هەندێک لە نوسراوی ( ٩٥ بەندی ) مارتن لۆسەر کە بریتین لە ( کاتێک کە خوا و عیسای مەسیحی مامۆستامان ووتی " تۆبە بکەن " بەو هیوایە بوو کە تۆبە بە درێژای ژیانی باوەڕداران فەرمانڕەوا بێت ، پاپا نە حەزی هەیە و نە لە توانایشیدایە کە لە هیچ سزایەک خۆش ببێت بێجگە لەوەی کە لە ژێر دەسڵاتی ئەو یا شەرعدا دانراون ، کەسانێک کە پیان وایە بە هۆی هەبوونی پسولەی لێبوردنەوە بە دڵنیای دەگەن بە رزگاری هاوڕێ لەگەڵ مامۆستاکانیان توشی لەعنەتی هەتا هەتای دەبن ... ) . (٣٥)

## جان کاڵڤن ( ١٥٠٩ – ١٥٦٤ ) ز

یەکێکە لە کەسایەتیە ریفۆرمخوارە گەورەکانی ئەوروپا لە فەرەنسا لە دایک بووە و لە شارێک گەورە دەبێت کە ئاین و پیاوانی کەنیسە تێیدا باڵا دەست بوون و بە هۆی ئەوەی کە باوکی پیاوێکی ئاینی بوو هەر زوو توانی خوێندن تەواو بکات ، کالڤن پاش ئەوەی دەچێت بۆ پاریس بۆ خوێندن بە بیروباوەڕی کەسە ریفۆرمەکانی وەک ( رابیلە ، ئیراسمۆس ) کە بەردەوام

ڕەخنەیان لە کەنیسە و خوێندنگەکان دەگرت ئاشنا بوو لەگەڵ بیروڕاکانی ( مارتن لۆسەر ) و زۆر پێی گاریگەر بوو ، ئەو ریفۆرمخوازە پاش ئەوەی بەشی حقوق لە زانکۆ تەواو دەکات و پاش کۆچی دوای باوکی توانی بە ئازادانە بیر بکاتەوە و ڕوو بکاتە خوێندنی ئاینی و توانی پاش شارەزابوون لە بیروباوەڕی کڵێسا و گەندەڵیەکانی ڕزگاری بێت .

پاش نوسینی وتارێکی نوسی و تێیدا ئیدانەی کەنیسەی کرد ئیتر بڕیاری دەستگیر کردنی درا و ئەمەیش بوو بە هۆی هەڵهاتنی و پاش ئەمەیش یەکەم کتێبی خۆی نوسی بە ناوی ( بنەماکانی ئاینی مەسیحی ) نوسی کە خوێندنەوەیەکی تازە بوو بۆ ئەو ئاینە و چاکسازی زۆری تێدا بوو ، پاش بڵاو بوونەوەی بیرو راکانی و زۆر بوونی لایەنگرانی پاشای فەرەنسا لە دادگاکانی پشکنیندا ژمارەیەکی لێ دادگای کردن و پاش هەڵهاتنی کاڵڤن بۆ سویسرا ئەو جێگەیە بوو بە وێستگەیەکی تری چاکسازی ئاینی . (٣٦)

ئەم زانایە بە تەواوەتی بڕوای بە یەکسانی قەشە و خەڵکی لای خوا هەبوو و ئەو پێی وا بوو کە هەموو کەس مافی تەفسیر کردنی ئیجیلی هەیە و ئەو دژی تێکەڵبوونی دەسەڵاتی کڵیسا و دەوڵەت بوو ، بیروڕاکانی لە رووی سیاسیەوە بەرەو سیتەمی ئۆرۆستۆکراتیەت چوو واتا دەسەڵات بە دەستی خەڵکی بێت و ئەو پێی وا بوو کە خەڵکی دەبێت گوێ رایەڵ بن . (٣٧)

کاڵڤن سیستەمێکی باشی دانا هەم بۆ پیاوانی ئاینی هەم بۆ سیاسیەکان و ئەوە سزای ئەوانەی دەدا کە لە نوێژ دوا دەکەوتن و وە داوێن پیسیان دەکرد و بە خراپە هەڵدەسان هە موو ئەمانە هۆکارێک بوون بۆ جەنگەکانی هیکۆنۆت بەمەیش زیاتر بڕوکانی گەشەیان کرد و بڵاو بونەوە ، پاش ئەوەی ئەم زانایە لە ساڵی ١٥٦٤ ز مرد . (٣٨)

بیروڕاکانی کالڤن یان کاڵڤینیزم کە بە بۆچونی ئەو لە کەنیسەدا چوار گروپ هەبون ( قەشەکان ، مامۆستاکان ، ریشسپیەکان و خزمەتکارانی کەنیسە ) کە هەر یەکە کاری تایبەتی خۆی هەبوو ئەم کارەیش بوو بە هۆی

ڕێکخستنی کەنیسە و بۆچونەکانی لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا زیاتر گەشـەی کـرد بەڵام پاش بزوتنەوەی یەسوعیەکان چونەوە سەر بوچونەکانی مـارتن لۆسـەر و کالڤینیزم زیاتر لە سکوتلاندە و ئەمەریکای باکور گەشەی کرد ...(٣٩)

# گەشەسەندنی چاکسازی ئاینی

پاش بەرپابوونی ئەم بزوتنەوەیە روبەروی چـەنـدین هـەڵکشان و داکشان و رێگری و بەرپایوونی جەنگ بویەوە ، سەد ساڵ پاش مردنی لۆسـەر جـەنـگ لە نێوان هەر دوو مەزهەبەکەدا لە ئارادا بوو لە هـەمـوو ئـەوروپـادا جگـە لـە ئسپانیا و ئیتالیا نەبێت و هاوکات چەنـدین جوڵانـەوەی تونـد لـە ئنگلتـەرا و سویسرا و فەرەنسا و هۆڵندا رویدا کـە کاریگـەری زۆری لـە دوای خـۆی لـەو شوێنانە جـێ هێـشت ، لـە سویـسرا قـەشـەیـەک بـە نـاوی ( زۆنقلـی ) دژی کەنیسە راپەڕی و لە ساڵی ١٥٣١ ز جەنگ لە نێوان هەر دوو مەزهەبدا بەرپا بوو وە قەشەی سویسری کوژرا و پاش ئەم کالڤن هات کـە کاریگـەری زۆری لە ئەمەریکا و سویسرا و ئینگلتەرا هەبوو .

مێـژووی فـەرەنـسا لـە نـاوەڕاسـتی سـەدەی ١٦ دا بـوو جێگـەی ململانیـەی کاسۆلیکی و پرۆتستانتی و چەندین شەڕی گەورە و خوێناوی بەرپا بوو ، لە فـەرەنـسا گـەورە ( دۆق کیـری ) کاسـۆلیکی ژمـارەیـەکـی زۆری هیکۆنـۆتی کوشت کە ئەم کوشتارگایەی بە جەنگی هیکۆنۆتی ناسـراوە کـە نزیکـەی ٣٠ ساڵی خایاند . (٤٠)

لە هۆڵەندایش رەخنەکان وەک فەرەنـسا بـە شـێوەی تونـدوتیژ دەرکـەوتـن و ئەم وڵاتـەیش چوو پاڵ پرۆتستانت و بە گشتی وڵات دابەش بوو بەسەر هەر دوو مـەزهـەبـدا ، گـەورەتـرین سـەرکـەوتنـی پرۆتـستانت ( کـاڵڤینیزم ) لـە سـکوتلاند پاشـان لـە ئـەمـەریکـای بـاکور بـەدەسـت ، بـەم شـێوەیـە ئـەم بزوتنەوەیە پەرەی سەند و گەشەی کرد و لە هەناوی خۆیدا چەندین گروپـی

تری هەڵگرتبوو وەک ( پیورتانەکان ) کە یەکێکە لە گرنگترین گروپە چاکەخوازە دژ بە ئەسقوفەکان کە ئەمان پرۆتستانگەلێکی بە رەگەز بەریتانی بوون کە دەیانویست کەنیسەی ئەو وڵاتە لە کاسۆلیکی پاک بکەنەوە و بەم جۆرە چەندین گروپی تر دروست بوون و ئەم بزوتنەوەیە بە تەواوەتی گەشەی کرد و لە جیهاندا بڵاو بوویەوە . (٤١)

## پەراوێز و سەرچاوەکانی بەشی یەکەم

١ — د . مسعود جلال مقدم ، کاریگەری ئایین لە کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان ، وەرگێڕانی سەعید بەشیر خەرپانەیی ، چاپی یەکەم ، ٢٠١٠، ل ٥ — ٧
٢ - د . مسعود جلال مقدم ، هەمان سەرچاوە ، ل ٢٥ — ٢٨
٣ — ئەرنۆڵد تۆینبی ، مێژووی مرۆڤایەتی ، وەرگێڕانی دڵشاد مستەفا وەسانی ، چاپی یەکەم ، ٢٠١٠ ، هەولێر ، ل ٤١٠
٤ — عەبدولعەزیز عەلائەدین کۆیی ،ژیان و رەوشتی پێغەمبەر (ص ) ، چاپی دووەم ، ٢٠١٠ ، هەولێر , ل ١٤
٥ - د . مسعود جلال مقدم ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٩٣
٦ — د . مستەفا غالیب ، فریدریش نبچە ، وەرگێڕانی سامان عەلی حەمید ، چاپی یەکەم ، ٢٠٠٨ ، سلێمانی ، ل ٦٨
٧ - د . مسعود جلال مقدم ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٤٤
٨ — ویل دورانت ، مێژووی شارستانیەت ، وەرگێڕانی عەبدوڵڵای رەسوڵی ، چاپی یەکەم ، ٢٠١١ ، سلێمانی ، ل ١٠٦ — ١٣٠
٩ — موزەفەر جەبار عەبدوڵڵا ، سەرەتایەک دەربارەی ئایین ، گۆڤاری کۆچ ، ژمارە ( ١٥ ) پایزی ٢٠١١ ، سلێمانی ، ل ٥٠ و ٥٤ و ٦١ .
١٠ — جفري برون ، تاريخ اوربا الحديث ، ترجمة علي المزروقي ، الطبعة الاولي ، ٢٠٠٦ ، عمان ، ل ٥٥

١١ – د . عبدالامیر محمد امین و محمد توفیق حسین ، مێژووی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ، وەرگێڕانی مستەفا سەعید عەلی ، چاپی یەکەم ، ٢٠١١ ، سلێمانی ، ل ٢٨
١٢ – م . سەلام عەبدولکەریم ، ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕست ، محازەرکانی مێژووی ئەوروپا لە بەشی مێژوو – قۆناغی یەک لە کۆلێژی پەروەردە لە زانکۆی گەرمیان، ، ساڵی خوێندنی ٢٠١٠ – ٢٠١١ ،کەلار
١٣ - د . عبدالامیر محمد امین و محمد توفیق حسین ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣١
١٤ - سەلام عەبدولکەریم ، سەرچاوەی پێشوو .
١٥ - عبدالامیر محمد امین و محمد توفیق حسین ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٣ – ٣٨
١٦- جفری برون ، سەرچاوەی پێشوو ، ص ٥٥ – ٦٥ .
١٧- د . عبدالامیر محمد امین و محمد توفیق حسین ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٨ – ٤٠ .
١٨ - د . عبدالامیر محمد امین و محمد توفیق حسین ، هەمان سەرچاوە ، ل ٢٥٥ – ٢٦٠ .
١٩ - د . کەمال مەزهەر ، ڕێنیسانس ، وەرگێڕانی فواد مەجید میسری ، چاپی سێیەم ، ٢٠٠٦ ، سلێمانی ، ل ٣٣
٢٠ - د . کەیوان ئازاد ئەنوەر ، ئەوروپا لەهەر دوو سەردەمی بوژانەوە و رۆشنگەریدا ، چاپی دووەم ، ٢٠٠٨ ، سلێمانی ، ل ٣١
٢١ - هاشم ساڵح ، سەرەتایەک دەربارەی رۆشنگەری ئەوروپی ، وەرگێڕانی شوان ئەحمەد ، چاپی دووەم ، ٢٠٠٩ ، سلێمانی ، ل ٥٨
٢٢ - جفری برون ، سەرچاوەی پێشوو ، ص ١٣
٢٣ - الدكتور مهدي محفوط ، اتجاهات الفكر السياسي في العصر الحديث ، الطبعة الاولي، ١٩٩٠، بيروت ، ص ٢٤.

٢٤ - هاشم ساڵح ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٨١

## پەراوێز و سەرچاوەکانی بەشی دووەم

١ – داریوش ئاشوری و دکتۆر بەهائەدین پازارگاد و رۆزبە ، فەرهەنگی نوێ ، وەرگێڕانی بورهان قانع ، چاپی دووەم ، ٢٠٠٣ ، سلێمانی ، ل ٥٦

* مەزهەبی پرۆنستانت ( هیگۆنت ) یەکێکە لە مەزهەبەکانی ئاینی مەسیحی و زۆرینەی شوێن کەوتوەکانی لە باکوری ئەوروپا و ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاو ئوسترالیادان ، لە سەدەی شانزە ئەم مەزهەبە لە مەزهەبی کاسۆلیکی جیابونەتەوە ، ووشەی پرۆنستانت بە مانای ( نارەزای protest ) دێت ، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کۆمەڵێک نوسەر ، سەدەکانی ناوەڕاست دادگاکانی پشکنین شۆڕشی فەرەنسا ،وەرگێڕانی هەورامان وریا قانع ، چاپی دووەم ، ٢٠١١ ، سلێمانی ، ل ٥٩٠

٢ - کۆمەڵێک نوسەر ، هەمان سەرچاوە ، ل ٥٥٨

٣ – الدكتور مهدي محفوط ، سەرچاوەی پێشوو ، ص ٥٠

٤ – د . کەمال مەزهەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥

** قوستەنتین دوا بەدوای دیقلدیانوس کە تا ساڵی ٣٠٥ لەسەر کورسی دەسڵات مایەوە و پاش پیر بوون و نەخۆش کەوتنی دەسڵات کەوتە دەست ئەم پاشایە کە چەندین جەنگ لەو دەمەدا رویان دا کە توانی بەسەریاندا زاڵ بێت و توانی بۆ جاری دووەم لە ساڵی ٣١٣ ز ئیمبراتۆریەتی رومانی یەکبخاتەوە و چەندین چاکسازی لە بواری مەدەنی و سەربازی و خزمەتگوزاریدا ئەنجامدا و توانی لە ساڵی ٣٣٠ ز پایتەختی نوێی لە بیزەنتە دامەزراند ، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ، جفری برون ، سەرچاوەی پێشوو ، ص ٤٦

٥ - http://www.arab- ency.com /index.php?module=pnEncyclopedia&func=display_term&id=١٢٢٢&m=١

٦ – مەحمود شاکر ، پوختەی مێژووی شارستانیەتەکان ، وەرگێڕانی مووسا محمد عبدالرحمن ، بەرگی دووەم ، چاپی یەکەم ، ٢٠١١ ، سلێمانی ، ل ٥٩٥

٧ – جان ام دان ، سەردەمی رۆشنگەری ، وەرگێڕانی جەهانگیری غەفاری ، چاپی دووەم ، ٢٠١١ ، سلێمانی ، ل ١٩

٨- http://ar.wikipedia.org/wiki/%D٨%A٥%D٨%B٥%D٩%٨٤%D٨%A٧%D٨%AD_%D٨%A٨%D٨%B١%D٩%٨٨%D٨%AA%D٨%B٣%D٨%AA%D٨%A٧%D٩%٨٦%D٨%AA%D٩%٨A

٩– فەرامەرز کوشان ، روانینێک بۆ مێژووی ریفۆرمیزەیشن و رۆڵی مارتن لۆسەر ، وەرگێڕانی رایان عوسمان ، گۆڤاری ئایدیا والا ، ژمارە ( ٣٠ ) ی کانونی یەکەمی ٢٠١١ ، ل ١٦٢

*** دادگاکانی پشکنین Inquisition لاپەڕەیەکی رەشە لە مێژووی ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاست کە ئەم مێژووە دەکرێت وەک تیرۆری ئاینی سەیر بکرێت ، ئەم دادگایە بریتی بوو لە دیوانێک یان دادگایەکی کاسۆلیکی کە ئەکی ئاشکراکردنی ئەو کەسانە بوو کە گوایە گومڕان و لە ئاینی مەسیحی لایان داوە ، لە ساڵی ١٢٢٤ ز دا ئیمراتۆری مەسیحی یەکەم کەس بوو بیری لەوە کردەوە سزای سوتاندن و خستنە ناو ئاگر بۆ خەڵکی گومڕ دەر بەکات ، ئەم دادگایە بە بڕیاری پاپا ( گریگۆری نۆیەم ) دامەزرا و لە هەر دوو سەدەی ١٥ و ١٦ دا گەیشتە لوتکە ، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کۆمەڵێک نوسەر ، ١٧٨٩ ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥١ .

١٠– محمود شاکر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٩٦
١١ – http://www.arab-ency.com/index.php?module=pnEncyclopedia&func=display_term&id=١٢٢٢&m=١
١٢- کۆمەڵێک نوسەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٦٨ – ٥٧٠ .
١٣ – د . کەیوان ئازاد ئەنوەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٦ – ٤٨ .
١٤– م . بارام دڵپاک ، ئەوروپای ڕێنیسانس ، محازەرەکانی مێژووی ئەوروپا لە بەشی مێژوو لە کۆلێژی پەروەردە لە زانکۆی گەرمیان ، ساڵی خوێندنی ٢٠١١ – ٢٠١٢ ، کەلار .
١٥ – سارا فلۆوەرز ، چاکسازی ئاینی ، وەرگێڕانی هەژار ڕەحیمی ، چاپی یەکەم ، ٢٠١١ ، هەولێر ، ل ١٤ .
١٦–جفری برون ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٨٠ .
١٧ – شوان ئەحمەد ، مێژووی ریفۆرمی ئاینی ، گۆڤاری سەردەم ، ژمارە ٥٣ ، کانونی یەکەمی ٢٠٠٧ ، سلێمانی ، ل ٢٥٦
١٨ - – الدکتور مهدي محفوظ ، سەرچاوەی پێشوو ، ص ٥٥
١٩ - سارا فلۆوەرز ، سەرچاوەی پێشوو ، هەولێر ، ل ٦٢
٢٠ - شوان ئەحمەد ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٧ – ٢٥٨
٢١- د . کەمال مەزهەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ، ل ٦
٢٢ – هاشم ساڵح ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٩٦ – ١٩٨ .
٢٣- سارا فلۆوەرز ، سەرچاوەی پێشوو ل ٨١ – ٨٨ .
٢٤ - کەیوان ئازاد ئەنوەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥١ – ٥٢
**** عشا ربانی ( Eucharist ) ئەم ووشەیە یونانیە بە مانای سوپاسگوزاری دێت ، کە ڕێورەسمێکی ئاینی مەسیحیە لە جەژنەکاندا بەکار دێت .. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە سارا فلۆوەرز ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٤٨
٢٥ - سارا فلۆوەرز ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٠ – ٢٢ .

٢٦ - م . بارام دڵپاک ، ئەوروپای ڕێنیسانس ، محازەرەکانی مێژووی ئەوروپا لە بەشی مێژوو لە کۆلێژی پەروەردە لە زانکۆی گەرمیان ، ساڵی خوێندنی ٢٠١١ — ٢٠١٢ ، کەلار .
٢٧- دكتور شوقي عطاالله الجمل ، دكتور عبدالله عبدالرازق ابراهيم ، تاريخ اوربا من النهضة حتي الحرب الباردة ، ٢٠٠٠ ، القاهيرة ، ص ٤٤
-٢٨- کەیوان ئازاد ئەنوەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٨
٢٩ - دكتور شوقي عطاالله الجمل ، دكتور عبدالله عبدالرازق ابراهيم ، سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٧
٣٠ — عومەر عەلی شەریف ، کورتەیەک لەمەڕ بزاڤە چاکسازییەکەی مارتن لۆسەر و جەنگی سی ساڵەی شووم ، گۆڤاری نەوشەفەق ، ژمارە ( ١٤ ) ، ئایاری ٢٠٠٤ ، کەرکوک ، ل ٣٣
٣١ — کۆمەڵێک نوسەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٥٨
٣٢ - عومەر عەلی شەریف ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٤
٣٣ ٣٣ - دكتور شوقي عطاالله الجمل ، دكتور عبدالله عبدالرازق ابراهيم ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٠
٣٤ - عومەر عەلی شەریف ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٥
٣٥ - سارا فلۆوەرز ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣١
٣٦— کۆمەڵێک نوسەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٦٤ — ٥٦٧
٣٧- الدكتور مهدی محفوط ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٧
٣٨ - جفری برون ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٩٢
٣٩- سارا فلۆوەرز ، سەرچاوەی پێشوو ،ل ١٣٨
٤٠ - جفری برون ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٩٢ — ٢٠٠
٤١ - سارا فلۆوەرز ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٣٨

## سەرچاوەكان

١ – كتێب :

- ا – سەرچاوەكان بە زمانی كوردی

١ – ئەرنۆڵد تۆینبی ، مێژووی مرۆڤایەتی ، وەرگێڕانی دڵشاد مستەفا وەسانی ، چاپی یەكەم ، ٢٠١٠ ، هەولێر

٢ – جان ام دان ، سەردەمی رۆشنگەری ، وەرگێڕانی جەهانگیری غەفاری ، چاپی دووەم ، ٢٠١١ ، سلێمانی

٣– داریوش ئاشوری و دكتۆر بەهائەدین پازارگاد و رۆزبە ، فەرهەنگی نوێ ، وەرگێڕانی بورهان قانع ، چاپی دووەم ، ٢٠٠٣ ، سلێمانی

٤ – د . عبدالامیر محمد امین و محمد توفیق حسین ، مێژووی ئەوروپا لە سەدەكانی ناوەڕاستدا ، و / مستەفا سەعید عەلی ، چاپ ١ ، ٢٠١١ ، سلێمانی

٥- د . كەمال مەزهەر ، رێنیسانس ، وەرگێڕانی فواد مەجید میسری ، چاپی سێیەم ، ٢٠٠٦ ، سلێمانی

٦ - د . كەیوان ئازاد ئەنوەر ، ئەوروپا لەهەر دوو سەردەمی بوژانەوە و رۆشنگەریدا ، چاپی دووەم ، ٢٠٠٨ ، سلێمانی

٧ – د . مستەفا غالیب ، فریدریش نبچە ، وەرگێڕانی سامان عەلی حەمید ، چاپی یەكەم ، ٢٠٠٨ ، سلێمانی

٨ – د . مسعود جلال مقدم ، كاریگەری ئایین لە كۆمەڵگا مرۆڤایەتییەكان ، وەرگێڕانی سەعید بەشیر خەرپانەیی ، چاپی یەكەم ، بی ساڵی چاپ

٩ – سارا فلۆوەرز ، چاكسازی ئاینی ، وەرگێڕانی هەژار رەحیمی ، چاپی یەكەم ، ٢٠١١ ، هەولێر

١٠– عەبدولعەزیز عەلائەدین كۆیی ،ژیان و رەوشتی پێغەمبەر (× ) ، چاپی دووەم ، ٢٠١٠ ، هەولێر

١١ - کۆمەڵێک نوسەر ، سەدەکانی ناوەڕاست دادگاکانی پشکنین شۆڕشی فەرەنسا ،وەرگێڕانی هەورامان وریا قانع ، چاپی دووەم ، ٢٠١١ ، سلێمانی
١٢– مەحمود شاکر ، پوختەی مێژووی شارستانیەتەکان ، وەرگێڕانی مووسا محمد عبدالرحمن ، بەرگی دووەم ، چاپی یەکەم ، ٢٠١١ ، سلێمانی
١٣ - هاشم سالّح ، سەرەتایەک دەربارەی رۆشنگەری ئەوروپی ، وەرگێڕانی شوان ئەحمەد ، چاپی دووەم ، ٢٠٠٩ ، سلێمانی
١٤– ویل دورانت ، مێژووی شارستانیەت ، وەرگێڕانی عەبدوللای رەسوڵی ، چاپی یەکەم ، ٢٠١١ ، سلێمانی

**-ب – سەرچاوەکان بە زمانی عەرەبی**

١ – جفري برون ، تاريخ اوربا الحديث ، ترجمة علي المزروقي ، الطبعة الاولي ، ٢٠٠٦ ، عمان
٢- دكتور شوقي عطاالله الجمل ، دكتور عبدالله عبدالرازق ابراهيم ، تاريخ اوربا من النهضة حتي الحرب الباردة ، ٢٠٠٠ ، القاهيرة
٣ - الدكتور مهدي محفوط ، اتجاهات الفكر السياسي في العصر الحديث ، الطبعة الاولي، ١٩٩٠، بيروت

**٢ - گۆڤار :**

١ – شوان ئەحمەد ، مێژووی ریفۆرمی ئاینی ، گۆڤاری سەردەم ، ژمارە (٥٣ )، کانونی یەکەمی ٢٠٠٧ ، سلێمانی ،
٢– عومەر عەلی شەریف ، کورتەیەک لەمەڕ بزاڤە چاکسازییەکەی مارتن لۆسەر و جەنگی سی ساڵەی شووم ، گۆڤاری نەوشەفەق ، ژمارە ( ١٤ ) ، ئایاری ٢٠٠٤ ، کەرکوک
٣– فەرامەرز کوشان ، روانینێک بۆ مێژووی ریفۆرمیزەیشن و رۆڵی مارتن لۆسەر ، وەرگێڕانی رایان عوسمان ، گۆڤاری ئایدیا والا ، ژمارە ( ٣٠ ) ، کانونی یەکەمی ٢٠١١

٤ – موزەفەر جەبار عەبدوڵلا ، سەرەتایەک دەربارەی ئایین ، گۆڤاری کۆچ ، ژمارە ( ١٥ ) پایزی ٢٠١١ ، سلێمانی

٣ – محازەرەکان :
١– م . بارام دڵپاک ، ئەوروپای رێنیسانس ، محازەرەکانی مێژووی ئەوروپا لە بەشی مێژوو - قۆناغی دوو لە کۆلێژی پەروەردە لە زانکۆی گەرمیان ، ساڵی خوێندنی ٢٠١١ – ٢٠١٢ ، کەلار
٢ – م . سەلام عەبدولکەریم ، ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕست ، محازەرکانی مێژووی ئەوروپا لە بەشی مێژوو – قۆناغی یەک لە کۆلێژی پەروەردە لە زانکۆی گەرمیان، ، ساڵی خوێندنی ٢٠١٠ – ٢٠١١ ،کەلار

٤ – سایتەکانی ئەنتەرنێت :
١ http://ar.wikipedia.org-
٢ - http://www.arab- ency.com

دەروازەی سێیەم

# ناپلیۆن لە رۆژهەڵات

لەشکرکێشی بۆ سەر میسر بە دووەمین شەڕی گەورەی ناپلیۆن دادەنرێت کە رۆڵی گەورەی لە مێژووی ژیان و سەرکەوتنی ئەودا تۆمار کرد و فەرەنسای گەیاندە پێگەیەکی تایبەتی ، لە ساڵی ١٧٨٩ ز ناپلیۆن سەرکردەی سوپای فەرەنسای کردو بەرەو میسر بۆ دامەزراندنی ئیمبراتۆریەتی فەرەنسی لە رۆژهەلات ، پۆناپەرت بە نهێنی بەندەری (تۆلۆنی ) فەرەنسی بڕی و دورگەی ( ماڵتا ) ی داگیر کرد و لەوێیشەوە گەیشتە میسر و لەگەڵ سوپاکەیدا چونە ( ئەبی قیر ) ی رۆژهەلاتی ئەسکەندەریە لە مانگی تەموزی هەمان ساڵ ، هەرچەندە دانیشتوانی شارەکە روبەڕویان بوونەوە بەلام ناپلیۆن پاش گرتنی و دانانی سەربازگەیەکی بچوک گەیشتە قاهیرە و پاش ئەمەیش ملی نا بۆ ( فەلەستین و سوریا ) ، لێرەدا بەشێوەیکی پوخت هەوڵ دەدەین بە شێوەیەکی بابەتی قسە لەسەر ئەم بابەتە بکەین بە هیوای سودبینینی خوێنەران بە شێوەیەکی کورت و خێرا واتا لە کەم ترین دێڕدا زۆرترین زانیاری بۆ خوێنەرانی خۆشەویست دەست بخرێت .

## کورتەیەک لە ژیانی ناپلیۆن پۆناپەرت ( ١٧٦٩ – ١٨٢١ ) ز

ئەم سەرکردە سەربازیە فەرەنسیە لە دوورگەی ( کۆرسیک ) لە دایک بووە ، دایکی (لتیشیا رامۆلیتۆر ) و باوکی ( شارل پۆناپەرت ) یان ناو بووە بۆخۆیان بەشداریان کردووە لەدەرکردنی فەرەنسا لەو دوورگەیەدا بەڵام دواتر ئەم راپەڕینە شکستی خوارد و باوکی ناپلیۆن کە پاریزەر بوو ناچار بوو لەو کێڵگەیەدا لەو دوورگەیە کار بکات ، ناپلیۆن دووەم منداڵی خێزانەکەیەتی و لە تەمەنی منداڵیدا خوێندنگەی سەربازی دەخوێنێت و پاشان دەچێتە ئەکادیمیای سەربازی لە پاریس و یەکێک لە ئامانجەکانی ناپلیۆن دەرکردنی فەرەنسیەکان بووە لە کۆرسیک و ئەمەیش وای لێ کردووە رقی لە فەرەنسیەکان ببێتەوە و لە کاتی بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسادا لە ١٧٨٩ ز ناپلیۆن بەئەم شۆڕشە دڵخۆش نەبووە و وەک روداوێکی دڵخۆشکەر سەیری نەکردووە بەڵام پاش گۆڕانکاریەکانی پاش شۆڕش کە ئەو دوورگەیە بە چەندین ماف گەیشت ناپلیۆن لە بۆچونەکانی پێشتری پاشگەز بوەوە و بوو بە ئەفسەرێکی بە ئەمەک بۆ فەرەنسا و شۆڕشەکەی و پاشتر ناپلیۆن بوو فەرەنسیەکی تەواو .

بەم شێوەیەو پاش ئەوەی کە ناپلیۆن بڕیار دەدات دژی ئنگلیزەکان شەڕ بکات پاش شەڕی ( بەندەری تۆڵۆن ) ئیتر ناپلیۆن ناوبانگ دەردەکات و پلەی لیوای پێ دەبەخشرێت ، لە ژیانیدا ئەم سەرکردە سەربازیە دەکەوێتە داوی ژنێک بەناوی ( جۆزفین ) و زۆری خۆشدەوێت و لەم رووەیەوە چەندین بەسەرهات و رووداو باس دەکرێت کە دەوترێت ئەم ژنە بە هۆی ئەوەی کە نەزۆرک بووە ناپلیۆن لە خۆشویستنی پەشیمان دەبێتەوە ، پۆناپەرت چەندین شەڕ بۆ سەرکەوتنی فەرەنسا بە ئەنجام دەگەیەنێت کەیەک لەو شەڕ و داگیرکاریانە هێرشە بۆسەر رۆژهەڵات و میسر ، پاش کودەتایەک ناپلیۆن توانی ببیتە سەرکردەی راستەقینەی فەرەنسا و لێرەوە سەردەمی قونسوڵیەت دەست پێ دەکات کە ناپلیۆن توانی ببێتە یەکەم

قونسوڵی فەرەنسا و لە ژیانی سیاسیی خۆیدا ناپلیۆن بڕیاری چاکسازی ئیداری و دارایی و یاسای دا بە ناوی خۆیەوە ، لە ١٢ی ئابی ١٨٠٢ دا ناپلیۆن لە راپرسیەکی گشتیدا بە کۆنسوڵی هەتاهەتای ئەو وولاتە هەڵبژێردرا و ئەمەیش رێگەی خۆش کرد بۆ حوکمی ئیمبراتۆریەت کە ناپلیۆن خەونی پێوە دەبینی و بەم شێوەیە بۆ چەندین ساڵ لەسەر تەختی ئیمبراتۆری فەرەنسا دەدانیشێت بەڵام ئەمە زۆر درێژە ناکێشی و چەندین هەوڵی تیرۆر کردنی پۆناپەرت دەدرێت و بەم شێوەیە و پاش چەندین سەرکەوتن سوپای بەهێزی ناپلیۆن لە ساڵی ١٨١٢ ز لە هێرشی بۆسەر روسیادا شکستێکی گەورە روبەڕویان دەبێتەوە و پاشان شکستی لە دژی ئنگلیز هەربۆیە ئەم سەرکردەیە لەلایەن دەسەڵاتدارێتی فەرەنساوە دووردەخرێتەوە بۆ دورگەی ( سانت هێلین ) و هەر لەو دورگەیە بە هۆی نەخۆشی شێرپەنجەوە کۆچی دوای دەکات لە ٥ی مایسی ١٨٢١ ز ، ناپلیۆن لە دورگەی سانت هێلین رۆژێک بە کەسانی چوار دەوری ووت " راستی ئەم ژیانەی من رۆمانێکی سەرسوڕهێنەرە " .

## هۆکارەکانی لەشکرکێشی ناپلیۆن بۆ رۆژهەڵات (میسر )

لێرەدا دەتوانین بە چەند خاڵێکی خێرا وەک لەسەرچاوەکاندا باس کراوە لەشکرکێشی ناپلیۆن بۆ سەر میسر بخەینە روو کە دەکرێت لەپشتی هێرشی ئەو سەرکردەیەوە بن بۆ ئەوەی روو بکاتە رۆژهەڵات کە سەرکردەکانی ئەم وولاتە پێشتریش بە ئاواتی دەست گرتن بەسەر میسردا بوون هەر بۆیە لە رێگەی جۆر بە جۆری وەک سیخور و گەشتیار و بازرگان و قوتابیەکانیانەوە زۆر زانیاریان لەسەر ئەم وولاتە کۆکردبووە وە:

١ – ململانیەی توندی نێوان فەرەنسا و بەریتانیا کە هەریەکەیان دەیویست سنوری دەسەڵاتی خۆی فراوان بکات بە تایبەت ساڵەکانی سەرکەوتنی

ناپلیۆن لە ئیتالیا کە ئەمە ڕۆژگارێکی تاریکە لە لاپەڕەکانی مێژووی بەریتانیادا لەو دەمانەدا .

٢ — حەز و ئارەزووی پۆناپەرت بۆ فراوانخوازی وەک هۆکارێکی دەرونی ئەو کەسایەتیە کە ئەمەیش وای کرد کە چەندین ئەندێشە و حەز و پلان بە مێشکیدا بێت ئەمەیەش بۆ ئەوەی ناوبانگی لە مێژوودا بمێنێتەوە وەک لە مێژووی ژیانی کەسایەتیەکاندا دەبینرێت و ئەم کارەی ناپلیۆنیش بۆ ئەوەی ناوبانگی ( ئەسکەندەریی ) پێ ببەخشرێت .

٣ — میسر لە رووی پێگەی جوگرافیایەوە دەکەوێتە سەر رێگەی (هند ) کە ئەو دەمانە ئەم رێگەیە بۆ وڵاتە داگیرکەرەکان گرنگ بووە ، بەمەیش فەرەنسا دەتوانێت دەست بەسەر ئەم رێگە بازرگانیەدا بگرێت و دەیشتوانێت لەم رێگەیەوە هاوکاری بزوتنەوە چەکداری و ئازادیخواز و یاخی بووەکانی موستەعمەکارنی ئنگلیز بدات لە ناوچەکەدا و بەمەیش دەیتوانی لە بەرژەوەندیەکانی ئەو وڵاتە لە رۆژهەڵاتدا بدات .

٤ — بورژوازەکانی فەرەنسا بەتایبەت شارەکانی خوارووی ئەو وڵاتە پەیوەندی بازرگانی باشیان لەگەڵ رۆژهەلات بە تایبەت میسر و سوریا و دوورگەکانی دەریای سپی ناوەڕاستدا هەبوو ، ئەم بازرگانانە لە مێژەوە حەزیان دەکرد فەرەنسا شوێن پێی خۆی لە میسر قایم بکات بۆ ئەوەی لایەنێکی سیاسی بەهێز و نزیک لە خۆیانەوە چاودێری و پارێزگاری رێگە بازرگانیەکانیان بۆ بکەن کە ئەمەیەش لە داگیرکاریەکانی ئەوروپادا بەردەوام ئەگەرێکی بەهێزکەر بووە بۆ لایەنی دەسەڵات کە سنوری داگیرکاریەکانی فراوانتر بکات .

٥ — ناپلیۆن دەیویست میسر بگەڕێنێتەوە بۆ باوەشی ئەوروپا ، وڵاتێک کە زەمەنێکی زۆر دوور بوون لێی و ئەو وڵاتە کە گەنجینەیەکی زۆری شوێنەواری هەیە و بۆ ئەوروپا بەردەوام گرنگ بووە بەمەیش ناپلیۆن بۆ ئەوروپای رابگەیەنێت کە ئەو دەتوانێت ئەو خەونەیان بۆ بەدی دێنێت و

بردنی گەنجینەی زۆری شوێنەواری میسر بۆ خۆی ، سەرباری بردنی خێر و بێری ئەو وولاتە بۆ فەرەنسا بە تایبەت لە رووی کشتوکاڵ و بازرگانیەوە .
٦ – گەندەڵی و دیکتاتۆریەتی پاشا و دەسەلاتدارانی میسر کە میللەتیان دەچەوساندەوە کە ئەمەیش بەتەواوەتی هاوولاتیانی بیزار کردبوو هەرچەندە چەند روبەڕوبونەوەیەکش هەبوو بۆ داگیرکاری فەرەنسا بەڵام ئەمانە کۆ دەنگی گشتی دروست نەکرد بۆ داگیرکردنی میسر لەلایەن ئەو وولاتەوە ، بە پێچەوانەیشەوە ئاڵوزی و گەندەڵی حوکم لە پاریس وای دەویست کە ناپلیۆن لە وولات دووربکەویتەوە بۆ ئەوەی گەر سەرکەوتوو بوو ئەوا بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بنکەی جەماوەری فراوان دەبێت .
٧ – لاوازی دەوڵەتی عوسمانی و مەمالیکە حاکمڕەواکانی ئەو وولاتە وای کرد کە هێرشی ئەوروپایەکان بۆ ئەو وولاتە دەست پێ بکات ، ئەمەیش لە راپۆرتەکانی سەفیری ئەو کاتی فەرەنسادا لە ئەستانە ( سانت پریێست ) دا دەردەکەوێت لە ساڵی ١٧٦٨ ز دا کە ئاراستەی وولاتەکەی کردووە .
٨ – ناپلیۆن پێی وابوو کە ئەستەمە لە نێو کیشوەری ئەوروپادا لە بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا بدرێت و لەم رووەوە ووتویەتی " ئەوروپا وا دێتە پێش چاو کە ئاشتی باڵی بەسەردا کێشاوە " واتا بۆ فەرەنسا ئەستەمە کە لە نێو خودی ئەوروپادا لە بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا بدات ئەمیش بەهۆی ئەوەی کە ئەو وولاتە جگە لەوەی بەهێزە لە نێو دوورگەیەکدایە کە هێرش کردنە سەری ئاسان نیە هەر بۆیە ناپلیۆن بیری لەوە کردەوە رووبکاتە رۆژهەلات بۆ لێدان لەو بەرژەوەندیانەی کە بەریتانیا لەو ناوچانە هەیەتی بەتاییەت رێگەی هند .

## شەڕەکانی ( جەنگ ) ناپلیۆن لە میسر و ڕۆژهەڵات

یەکەم // جەنگەکانی لە میسر ، پاش دەرچونی ناپلیۆن لە فەرەنساوە بۆ ئەو وولاتە ڕووبەڕووی چەندین جەنگ بووە لە لایەن هاولاتیانی میسرەوە کە ئەمەیش دەکرێت بە هەوڵەکانی ڕێگری لە داگیرکاری دابنرێن کە زۆرێکی ئەو جەنگانە لە بەرژەوەندی دەوڵەتی داگیرکەر شکاوەتەوە و لە زۆرێکیاندا خەڵکی سڤیل بوونەتە قوربانی کە دەکرێت بە کورتی ئاماژە بە هەندێک لەو شەڕانە بکەین بۆ ڕێگری لەداگیرکاری لەو وولاتە .

١ – **جەنگی ئەبی قیر :** ئەم جەنگە لە نێوان کەشتی گەلی فەرەنسی و بەریتانی لەو وولاتە رووی دا لە ئەبی قیر لە تەموزی ١٧٩٨ ز ، لەم جەنگەدا کەشتی گەلی ئنگلیز گورزێکی کاریگەری لە گەشتی گەلی فەرەنسا وەشاند بەڵام دواجار فەرەنسیەکان توانیان بگەنە ئەسکەندەریە ئەمەیش پاش گەیشتنی ناپلیۆن بۆ ئەو وولاتە سەربازگەیەکی بچوکی لە ئەبی قیر دانا و بەرەو ئەسکەندەریە بەڕێکەوت .

٢ – **جەنگی ئەسکەندەریە :** ئەم جەنگە لە هەمان مانگدا روویدا لە نێوان خانەدانەکانی ئەو شارە و سوپاکەی ناپلیۆندا ، هەر زوو سوپاکەی ناپلیۆن سەرکەوت بەسەر خانەدانەکانی ئەسکەندەریە و جەنگاوەرە میسریەکاندا .

٣ – **جەنگی ئەهرام :** ئەم جەنگە یەکێکە لە جەنگە گەورە و کاریگەرەکان کە لە ٢١ی تەموزی ١٧٩٨ ز لە نێوان مەمالیەکەکان (دەسلاتدارانی میسر ) و جەنگاوەرەکانی ناپلیۆندا لە نزیک هەرەمەکانی ( جیزە ) روویدا لە نێو لمی بیابان و تینی زۆری گەرمای ئەو ڕۆژە، ناپلیۆن لەم جەنگەدا بەسەربازەکانی ووت " چل سەدەیە ئەو هەرەمانە نیگەرانی ئێوەن " بەمەیش دەردەکەوێت کە ئەم جەنگە کاریگەر و یەکلاکەرەوە بووە و بەمەیش فەرەنسیەکان توانیان سەربکەون و مەمالیکەکانیش بە خراپی شکان ئەمیش بە هۆی بێ پلانی و نەبوونی ستراتیجی جەنگیەوە ، سەرکردەی ئەم شەڕە

( موراد بەگ ) بوو کە خۆی و ژمارەیەک لە جەنگاوەرەکانی هەڵهاتن بۆ ( صەعید ) .
٤ – پاش ئەم جەنگە کە یەکلاکەرەوە بوو بۆ فەرەنسا ناپلیۆن توانی بچێتە ناو قاهیرەوە و داگیری بکات کە لەو کاتەدا دوو کەس دەیانویست ببنە فەرمانڕەوا کە هەردویان مەمالیک بوون ( ئیبراهیم بەگ ، موراد بەگ ) کە دواتر هەڵهاتن و پاش ئەمەیش بەشێوەیەکی گشتی فەرەنسا توانی دەست بەسەر میسردا بگرێت و بە مەرامی خۆی بگات .
٥ – **جەنگی دووەمی ئەبی قیر :** ئەم جەنگە لە نێوان تورکەکان و فەرەنسایەکاندا رویدا بەڵام فەرەنسایەکان دیسان سەرکەوتن .
گەر بەشێوەیەکی وورد تەماشا بکەین دەردەکەوێت لە ماوەی چەند مانگێکدا فەرەنسایەکان توانیان میسر داگیر بکەن سەرباری رووبەڕووبونەوە بەڵام بە هۆی ناهاوسەنگی سوپای فەرەنسی و شەڕەکەرانی بەرامبەریەوە هەروەها کەمی چەک و تەقەمەنی و بیزاری خەڵک لە نەهامەتی و کەم و کوڕی و ئیرادەی خودی ناپلیۆن بۆ داگیرکاری لە رۆژهەڵات وای کرد کە هەر زوو فەرەنسا دەست بەسەر میسردا بگرێت و رەگی لێ داکوتێت و بە چەند ساڵێکی کەم بەڵام گرنگ حوکمی ئەو وڵاتە بکات کە ئەم داگیرکاریە کاریگەری ئەرێنی و نەرێتی لەسەر ئەو وڵاتە بەجێ هێشت .
دووەم // جەنگەکانی لە سوریا و فەلەستین ، پاش ئەوەی ناپلیۆن توانی لەماوەیەکی کەمدا دەست بەسەر میسردا بگرێت بەو ئومێدەیشەوە ویستی داگیرکاریەکەی فراوان بکات هەر بۆیە بڕیاری هێرش کردنە سەر فەلەستین و سوریای دا کە بۆ ئەمەیش دەبوو روبەڕوی سەرباری خەڵکی روبەڕوی دەسەڵاتداری ئەو ناوچەیە بە پلەی یەک تورکەکان و پاشان بەریتانیەکان ببێتەوە هەر بۆیە لەشکرکێشی کردە سەر ئەو جێگایانە بە ئومێدی زیاتر دەست گرتن بەسەر رۆژهەڵاتدا .

١ – پاش ئەوەی ناپلیۆن زانی کە عوسمانیەکان بە سوپایەکەوە بەرەو سوریا هاتون ئەویش خۆی ئامادە کرد و بە سوپایەکی تۆکمەوە بەرەو سوریا و فەلەستین بەڕێکەوت بە هۆی زەبرو زەنگ و توندوتیژیەکانیەوە شارەکان یەک لەدوای یەک داگیر دەکران بەم شێوەیەش یەک شارێک کە داگیر کراو دەستی بەسەرا گیرا لەلایەن ناپلیۆنەوە شاری (عریش ) بوو پاشان شاری ( یافا ) لە ١٤ ی مارسی ١٧٩٩ ز هێرش کرایە سەری پاش ماوەیەک بەرگری کردن بە مەبەستی پاراستنی شارەکە لە داگیرکاریەکانی ناپلیۆن بەڵام دواجار ئەو سەرکردەیە پەیامێکی ئاراستەی خەڵکی ئەو شارە کرد گەر بە ئاشتی خۆیان رادەست بکەن ئەوا پارێزراو دەبن بە پێچەوانەوە توشی کوشتن و بڕین دەبنەوە هەر بۆیە رێگە چارەی دووەم لە لایەن خەڵکی شارەکەوە هەڵبژێردرا هەر بۆیە لە ١٦ی نیساندا سوپاکەی ناپلیۆن بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە شارەکەیان داگیر کرد بەشێوەیەک بە تەنها لە شەڕی ئەو شارەدا نزیکەی چوار (٤ ) هەزار سەربازی عوسمانی کوژران و بەم شێوەیە فەرەنسیەکان توانیان لەم شەڕەدا سەربکەون بەسەر هاوڵاتیان و سوپای عوسمانیدا .

٢ – **شەڕی عەککا ( ئاکر ) :** ئەم شەڕە لە نێوان فەرەنسایەکان کە ناپلیۆن سەرکردایەتی دەکرد کە سوپاکەیان پێک هاتبوو لە ١٣ هەزار سەرباز لەگەڵ تورکەکان کە دواتر ئنگلیزەکان هاوکاریان کردن روویدا لەبەردەم قەڵای ئەو شارەدا ، لە ئەنجامدا سوپای ناپلیۆن شکستی هێنا و نزیکی سێ (٣ ) هەزار سەربازی فەرەنسی کوژران و دواتر سوپاکەی پۆناپەرت گەڕایەوە بۆ میسر لە ٢٠ی ئایاری ١٧٩٩ ز ، ئەم شەڕ و دۆڕانە بەشێوەیەک کاریگەری لەسەر ناپلیۆن هەبوو لەکۆتایەکانی تەمەنیدا داخی سەرکەوتنی هەڵدەکێشا .

## هۆکارەکانی شکانی فەرەنسایەکان لە شەڕی عەککادا :

بەشێوەیەکی گشتی دەکرێت ئاماژە بە چەند خاڵێک بدەین کە کاریگەری هەبوو لەوەی کە فەرەنسایەکان لەم شەڕەدا توشی ئەو شکستە گەورە بوون کە کاریگەری لەسەر ناوبانگیان لە ناوچەکەدا هەبوو لەوانە :

١. بڵاوبونەوەی نەخۆشی تاعون لەنێو سەربازەکانی ناپلیۆندا .

٢. سەختی قەڵای عەککا کە بەرگری کاران لەو شارەدا بوون بەشێوەیەک کە تۆکمەی و قایمی قەڵاکە رۆڵێکی سەرەکی هەبوو بۆ سەرکەوتن .

٣. زۆری ژمارەی سەربازانی تورک لەم جەنگەدا لەچاو فەرەنسایەکان، هەروەها بیزاری و ماندووبونی فەرەنسیەکان بەدەست شەڕە زۆرەکانی ناپلیۆنەوە .

٤. هاوکاری کردنی بەریتانیەکان بۆ تورکەکان ئەویش لە رێگەی هاوکاری کردنی چەک و تەقەمەنی و خۆراکەوە .

## ناپلیۆن لە قاهیرەدا

هەرکە ناپلیۆن گەیشتە قاهیرە لەو شارەدا ووتارێکی پێشکەش کرد کە سەرەتای دەست پێکی ووتارەکەی بە ناوی خوا و پێغەمبەری ئیسلامەوە بوو ، پاشان باسی لە هەر سێ چەمکی ( ئازادی ، عەدالەت ، مافی هاوڵاتی بوون )ی بۆ کردن وەک بنەماکانی شۆڕشی فەرەنسی ١٧٨٩ ز ، هاوکات بە توندی باسی لەوەیش کرد کە هەر کەس بە رووی سەرباز و فەرەنسایەکاندا بوەستێتەوە ئەوە چارەنوسی بە خراپ ترین شێوە دەبێت لە کوشتن و بڕین ، پۆناپەرت لە کەسایەتی و شێخەکانی قاهیرە ئەنجومەنێکی پێک هێنا کە بە ( دیوانی قاهیرە ) بەناوبانگە و مەبەستیش لەم ئەنجومە بۆ رایی کردنی کاروبارەکان بووە بەڵام ئەم ئەنجومەنە زیاتر راوێژکاری بووە و زۆر تر لە خزمەتی فەرەنسیەکاندا بووە و تەنانەت ئەندامانی ئەم ئەنجومە بەڵێنیان دابوو هیچ کارێک دژی فەرەنسا و سوپاکەی لەو وڵاتەدا نەکەن ،

ناپلیۆن سیستەمێکی بەڕێوەبردنی لە قاهیرە دانا کە بە سیستەمی (بەڕێوەبردنی ناپلیۆن) ناسراوە کە ئەو سیستەمە بریتی بوو لە :

١ – لە هەموو شار و گوندێکدا دەسەڵات لەژێر دەستی فەرەنسایەکاندا دەبێت .

٢ – پێک هێنانی لیژنەیەک لە میسریەکان بۆ راوێژکاری لە کاروبارەکاندا .

٣ – رێز لە ئاینی ئیسلام و پیاوانی ئاینی ( مەلا ) بە تەواوەتی بگیرێت .

٤ – پێک هێنانی ( ئەنجومەنی شاری قاهیرە ) لە ژێر چاودێری خۆیدا .

٥ – دەبێت باج و خەراج و دەرامەتەکان بە شێوەیەک بێت خەرجی سوپا دابین بکەن .

## شۆڕشی میسریەکان دژی فەرەنسیەکان

لەبەرامبەر داگیرکاریەکانی فەرەنسا لە میسردا چەندین نارەزای و رووبەڕوبونەوە رویدا کە زیاتر خۆی لە هەردوو شۆڕشی یەکەم و دووەمی قاهیرە دا دەبینێتەوە کە یەکەمیان بریتی بووە لە شۆڕشی یەکەمی قاهیرە کە لەم شۆڕشەدا ژمارەیکی زۆر لە هاولاتیان لە چینی پیاوانی ئاینی و کرێکار و جوتیاران بەشداریان تێدا کرد ئەمەش بە هۆی زوڵم و زۆری فەرەنسیەکان لەو وولاتەو زیاد کردنی باجەکان هەر بۆیە ( مزگەوتی ئەزهەر ) بووە شوێنی کۆبوونەوەی دەنگە نارەزاکان و بەم شێوەیە پێک هەڵپژان لە نێوان میسریەکان و فەرەنسیەکان لە ٢١ ی تشرینی یەکەمی ١٧٩٨ ز رویدا و هەر دەست بە جێ ناپلیۆن فەرمانی کرد ئەو دۆخە کۆنترۆڵ بکەن و بەمەیش ژمارەیەکی زۆر هاولاتی کوژران و مزگەوتی ئەزهەر درایە بەر تۆپەکانی سوپای ناپلیۆن و نزیکەی چوار هەزار کەس کوژران و ئەم شۆڕشە بە دڕندانە ترین شێوە سەرکەوت کرا و ئەزهەریش داگیر کراو و سوکایەتی زۆریش بە پیرۆزیەکانی خەڵک کران .

پاش بەرپابوونی شۆڕشی یەکەمی قاهیرە و ستەمی زۆری فەرەنسیەکان ئەمەیش وای کرد کە گڕوتینی خەڵکی زیاتر بێت و هەر بۆیە شۆڕشی دووەمی قاهیرە بە رووی ( جەنراڵ کلیبەر ) بوە کە ناپلیۆن دوای خۆی کردی بە حاکم لەو وولاتە و ئەمیش زۆر بە توندی دژی شۆڕشەکە وەستایەوە بەڵام شۆڕش زیاتر پەرەی دەسەند هەربۆیە ئەمەیش وای کرد کە کلیبەر ناچار بوو داوای بەستنی پەیماننامە بکات لە دەوڵەتی عوسمانی ئەمەیش پەیماننامەی ( عەریش ) ی بەدوادا هات لە ساڵی ١٨٠٠ دا بەڵام ئنگلیزەکان بەم پەیماننامەیە رازی نەبوون و لە رێگەی بەستنی پەیماننامەی ( ئەمیان ) ی نێوان فەرەنسا و بەریتانیا فەرەنسا لە کۆتای ئازاری ١٨٠٢ میسری بەجێ هێشت .

## دەرئەنجامی شالاوەکانی ناپلیۆن پۆناپەرت بۆ سەر میسر و رۆژهەلات

سەرباری ئەوەی کە ناپلیۆن میسری داگیر کرد و خێروبێری وولاتەکەی لە زۆر بواردا بۆ خزمەتی خۆی و سەربازەکانی بەکار هێناوە و ژمارەیەکی زۆر لە نەیار و شۆرشگێر و هاولاتی سڤیلی کوشت و زۆر شار و گوندی وێران کرد ، زۆر جار بێریزی بەرامبەر و زانا و مەلاکان نواندووە بەتایبەت لە شۆڕشی یەکەمی قاهیرەدا کە بە ئەسپەکانیەوە چوە نێو ( ئەزهەر ) ەوە ، سەرباری هەموو ئەوانە دەکرێت بڵێین شالاوی فەرەنسیەکان لە زۆر بواردا توانی خزمەت بە میسریەکان و رۆژهەلات بکات و گەلێک دەرئەنجامی هەبوو لەوانە :

- دەرئەنجامە کۆمەلایەتیەکان : ئاشنابوونی میسریەکان بە شارستانیەتی رۆژئاوا لە زۆر بواردا کە لە ژیانی رۆژانەی خەڵکیدا رەنگی دابووەوە ، ئاشنابوونی میسریەکان لە رووی سسیستەمی کارگێڕیەوە کە توانراوە لە رووی کۆمەلایەتیەوە سودی لێوەربگرێت وەک تۆمارەکانی لەدایک بوون و مردن و ریسا و یاسا دادوەریەکان .

• دەر ئەنجامە زانستیەکان : ناپلیۆن لە هێرش کردنیدا بۆ سەر میسر ژمارەیەک زانای لەگەڵ خۆی هێنابوو کە بریتی بوون لە ( ١٥٠ ) زانا و زیاتر لە ( ٢٠٠٠ ) پسپۆڕی هونەر و وێنە و تەکنیکی کە ئەمانە گەلێک کاری باشیان کرد بەشێوەیەک لە نێوان سالانی ١٧٩٨ – ١٨٠١ ز دا ئەم زانا و پسپۆڕانە کتێبی ( وەسفی میسر ) یان نوسی کە ١١ بەرگە زۆر لایەنی ژیانی میسری لە خۆ گرتووە و ئەم پەرتوکە گرنگە بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت لێکۆڵینەوە لەسەر میسر بکەن لەو ماوەیەدا و کاریگەری بۆ ئێستا . ، بیرۆکەی هەڵکەندنی کەناڵی سویس کە هەردوو دەریای ناوەڕاست و سوری بەیەک دەگەیاند بەڵام ئەم پرۆژەیە لەو دەمەدا سەری نەگرت بەهۆی ئەو هەڵەیەی کە دەریای سور لە دەریای ناوەڕست بەرزترە ، دۆزینەوەی هێمای زمانە کۆنەکانی میسر و خەتەکانیان ( هیرۆغلیفی ، هیراتقی ... ) و هەروەها دۆرزینەوەی زیاتری شارشتانیەت و لایەنەکانی ژیاری ئەو وولاتە کە میسریان بە شارستانیەتی فیرعەونەکان داناوە ، لەم هێرشەدا یەکەم نەخشەی تیرەیی میسر کێشرا کە دواتر سودی لێوەرگیرا.

• دەر ئەنجامە سیاسیەکان : هێرشی فەرەنسیەکان بۆ سەر میسر وولاتە ئەوروپیەکانی بە ئاگا هێنایەوە لەوەی کە میسر پێگەیەکی ستراتیچی گرنگی هەیە بەتایبەت وولاتی بەریتانیا ، ورژاندنی هەستی نەتەوایەتی (وعی ) لای میسریەکان و یەکگرتویان بەرامبەر دوژمن بە تایبەت دەولەتی عوسمانی .

• دەر ئەنجامە رۆشنبیریەکان : هێنانی چاپخانەیەکی فەرەنسی بۆ میسر بە شێوەیەک کە باس دەکرێت یەکەمین جار فەرەنسیەکان چاپخانەیان بۆ ئەو وولاتە هێناوە کە بە پیتی لاتینی و یۆنانی و عەرەبی چاپی پێ کراوە ، دامەزراندنی یەکەمین کۆڕی زانستی لە رۆژهەلاتی ناوەڕستدا و هەروەها کۆڕی زانیاری میسری ، دامەزراندنی قوتابخانەی فەرەنسی لەو وولاتە بۆ مندالانی فەرەنسی کە لەوێدا دەژیان ، دوو رۆژنامەی بە فەرەنسی

و رۆژنامەیەکی عەرەبی لەو وولاتە بلاوکردەوە کە رۆژنامە عـەرەبیـەکـە نـاوی ( التنبیـە ) بـووە و بـەیـەکـەمـین رۆژنامـەی چـاپکراو بـە زمـانی عـەرەبـی دادەنرێت .

لە کۆتایدا دەکرێت ئەوە رون بکەینـەوە پـاش ئـەوەی بـۆ مـاوەی سـێ سـاڵ فەرەنسا لە میسر و رۆژهەلات مایەوە بەشێوەیەک کە تا ئێستایش پاشـماوە و کاریگەریان لە ناوچەکەدا دیارە و هەندێک گۆڕی سەربازەکانیان هەر مـاون و بە گشتی سەرکەوتو نەبون لە مانەوەیان لە میـسر و رۆژهـەلات ، نـاپلیۆن بەهۆی هاتنی بۆ میسر و رۆژهەلات خاوەنی چەندین ووتـە و قـسە و پـەنـدە کـە بـە هـۆی هـاتنی بـۆ ناوچـەکـە کردونـی وەک [ " گـەر بمتوانیایـە دەسەلاتدارێتی میسر بکەم ئەوا نەمدەهێشت دلۆپێک ئـاو لـە رووبـاری نیـل بەفیرۆ بچێت و هەمومیم لە بواری کشتوکاڵ و بەرهەم هێناندا بەکـار دەهێنـا " ، " خۆشترین کاتـەکـانی ژیـانم لـە میـسر بـەسـەر بـرد کـە لـە ئـەوروپـای هەوراویدا بواری بیرکردنەوەم کەمتر بوو بـەلام گـەر لـەم وولاتـە بمێنمـەوە و حوکمـداری بکـەم ئـەوا دەتـوانم رەوڕەوەی مێـژوو بگـۆڕم " ، " گـەر بـە فەرمانڕەوای میسر نەبومایە ئەوا بە فەرمانڕەوای وولاتی خۆیشم نەدەبووم " ، " ئاینی ئیسلام وەک ئاینی مەسیحیەت سیاسەت گەناندویەتی " ] ، دوای کـوژرانی (کلیبـەر ) حـاکمی دوای نـاپلیۆن لـە میـسر و مـۆرکردنی رێکەوتنامەیەک لەگەڵ بەریتانیادا ،فـەرەنـسا لـە میـسر چـووە دەرەوە بـەلام پاشتر کێشەیـەک دێتـە پێـشەوە بـۆ وولاتـە ئـەوروپیـەکـان کـە بـە کێـشەی رۆژهەلات ناو دەبرێت و پاشتر داگیرکاری وولاتە ئەوروپیەکان بـۆ ناوچـەکـە دەست پی دەکات .

**سەرچاوەکان :**

١-د . شوقي عطا اللة الجمل و د . عبداللة عبدالرزاق ابراهيم ، تاريخ اوروبا من النهضة حتي الحرب الباردة ، قاهيرة ٢٠٠٠-
٢- يوسف سعد يوسف ، نابليون بونابرت ،الطبعة الاولي ، مصر ، ١٩٨٨ .
٣-جفري برون ، تاريخ اوروبا الحديث ، ترجمة : علي مزروقي ، الطبعة الاولي ، عمان ، ٢٠٠٦ .
٤- حسن جلال ، حياة نابليون، الجزئ الاول ، بدون سنة وموقع الطبع .
٥-ئ ، چ ، تارلە ، ناپلیۆن ، وەرگێڕانی :عومەر رەسوڵ ، چاپی سێیەم ، سلێمانی ، ٢٠٠٩ .
٦- محمود شاکر ، پوختەی مێژووی شارستانیەتەکان ، وەرگێڕانی :جرسی محمد عبدالرحمن ، بەرگی دووەم ، چاپی یەکەم ، ٢٠١١ .
٧- ه .ا . ل فیشەر ، مێژووی نوێی ئەوروپا ، وەرگێڕانی : شکور سلیمان و سەردین ئەرجان ، هەولێر ، ٢٠٠٩ ز .
٨- د . عبدالعزیز سلیمان نەوار ، مێژووی هاوچەرخی ئەوروپا ، وەرگێرانی : خالد هەرکی ، چاپی سێیەم ، هەولێر ، ٢٠١٢ ز .
٩- نەوشیروان مستەفا ئەمین ، بەدەم رێگاوە گوڵچنین ، کتێبی دووەم ، بەرگی یەکەم ،بیروت ، ٢٠١٣ ز .
١٠- هەورامان وریا قانع ، شۆڕشی فەرەنسی ١٧٨٩ ، چاپی سێیەم ، سلێمانی ، ٢٠١٠ ز .
١١ www.ar.wikipedia.org-
١٢ www.kenanaonline.com-

٥- ئ ، چ ، تارلە ، ناپلیۆن ، وەرگێڕانی :عومەر رەسوڵ ، چاپی سێیەم ، سلێمانی ، ٢٠٠٩ .
٦- محمود شاكر ، پوختەی مێژووی شارستانیەتەكان ، وەرگێڕانی :جرسی محمد عبدالرحمن ، بەرگی دووەم ، چاپی یەكەم ، ٢٠١١ .
٧- ه .ا . ل فیشەر ، مێژووی نوێی ئەوروپا ، وەرگێڕانی : شكور سلیمان و سەردین ئەرجان ، هەولێر ، ٢٠٠٩ ز .
٨- د . عبدالعزیز سلیمان نەوار ، مێژووی هاوچەرخی ئەوروپا ، وەرگێرانی : خالد هەركی ، چاپی سێیەم ، هەولێر ، ٢٠١٢ ز .
٩- نەوشێروان مستەفا ئەمین ، بەدەم رێگاوە گوڵچنین ، كتێبی دووەم ، بەرگی یەكەم ،بیروت ، ٢٠١٣ ز .
١٠- هەورامان وریا قانع ، شۆڕشی فەرەنسی ١٧٨٩ ، چاپی سێیەم ، سلێمانی ، ٢٠١٠ ز .
١١ -www.ar.wikipedia.org
١٢ -www.kenanaonline.com



ناپلیۆن



فەرەنسا لە میسر

## دەروازەی چوارەم

# فەلسەفەی مێژوو لای چوار فەیلەسوفی ئەوروپی

فەلسەفە ١ لە چاو جۆرەکانی زانستدا بە واتای فراوانی زانست دێت واتا جۆرێک بە ئاگابونە لە جیهان ، فەلسەفە لای ئەرسۆییەکان دوو بەش دەگرێتەوە ( حیکمەتی عەمەلی ، حیکمەتی نەزەری ) ، فەلسەفە بە واتا تایبەتیەکەی تەنها بە حیکمەتە سەروسروشتیەکان دەوترێت کە لە زمانە بیانیەکاندا میتافیزیقی پێ دەوترێت و فەیلەسوف کەسێک بوو کە باش لە میتافیزیقی دەزانی بەڵام فەلسەفە بە مانا فراوانەکەی هاو واتای زانستە بەشێوەیەکی گشتی ، فەیلەسوف واتا خۆشەویستی دانایی ، ، ئەمڕۆ ووشەی فەلسەفە لە فەرهەنگی رۆژئاوایەکاندا واتایەکی تایبەتی وەرگرتووە ، مەعریفەکانی وەک ( فەلسەفەی مێژوو ، فەلسەفەی زانست ، فەلسەفەی ئەخلاق ... ) لە دایک بوونە و گەشەیان کردووە کەواتە فەلسەفە لە هەموو ئەو بابەتانەی سەرەوەدا بە واتای " زانستناسی " دێت ٢ .

یەکەم کەس کە زارەوەی (فەلسەفەی مێژوو ) ی داهێنا لە نوسینەکانیدا ڤۆڵتێر ( ١٦٩٤ — ١٧٧٨ ) ز بوو ڤۆڵتێر لە بەکارهێنانی ئەم زاراوەیەدا مەبەستی نەبوو لقێک لە لقەکانی زانستی مرۆی دابمەزرێنێت ، بەڵکو ئەوەبوو مێژوونوس دەبێت لۆجیکی فەلسەفەی ئەقڵانی لە لێکۆڵینەوەی مێژوویدا بەکار بهێنێت و خۆی نەداتە دەستی ئەوەی کە لە کتێبە کۆنەکاندا هاتووە لە هەواڵ و رووداو گێڕانەوە ، پاش ئەمە فەلسەفەی مێژوو زۆری نەبرد بوو بە بابەتێکی سەربەخۆ کە ئامانج و پرۆگرامی خۆی هەیە ، لێرەوە واتا و مانای مێژوو گۆڕا لەوەی کە مانای مێژوو قوڵتر بووە لەوەی کە تەنها نوسینەوە بێت ٣ .

سەرەڕای ئەو بۆچونەی سەرەوە بەڵام بۆچونێکی تر هەیە کە ئەویش ئەوەیە کە تا ئێستا بە تەواوەتی ساغ نەبوەتەوە کە لە چ سەردەمێکدا بابەتی فەلسەفەی مێژوو پەیدا بووە و رون نەکراوەتەوە چ هزرمەندێک داهێنەر و رابەرێتی ، ئەوەی هەیە کە لە سەردەمی رێنیسانسدا سەری هەڵدا و لەو سەردەمەدا لاهوتی لەبەر دەم زانست و فەلسەفەدا پاشەکشەی کردووە ، لێرەدا باسی ئەوە هاتە ئاراوە کە مێژوو مێژووی گەلە بە گشتی یان هی تاکە کەس و پاشاکانە کە لێرەدا بۆ ئەم وەڵامە لایەنی سیاسی و فەلسەفی هاتە ئاراوە ٤ .

وەک پەیوەندیداران باسی لێوە دەکەن فەلسەفەی مێژوو مانای رامانە بۆ هەموو مێژوو ، کەواتە فەلسەفەی مێژوو وەک قانون یان وەک ئەو زانستەی لێ هاتووە کە مێژوو بەشێوەیەکی بابەتی لە رێگەی لێکدانەوەی ( زانستی ) یەوە کە خودی هاوکێشەکانی خۆیەتی دەبێت بە زانست ، لێرەدا کێشە ئەوەیە کە مێژوو یەک بیرۆکە و یەک هاوکێشەی نیە وەک ئەوەی لە زانستە پەتیەکاندا هەیە واتا یەک لەگەڵ یەک گوزەرەان دەکەن پێچەوانەی زانستەکانی تر ، بەم شێوەیە بیرۆکەی نوێ بیرۆکەی کۆن دەسڕێتەوە و دوو بیرۆکەی دژ بەیەک پێکەوە ناگونجێن ، لەبەر ئەوە

فـەلسەفـەی مێـژوو لـەوە زیـاتر کـە ( بیروبۆچـون ) بێـت هیچـی تـر نیـە ، هەروەک و راوبۆچونی سیاسەتمەداران وایە کە ئایە مێژوو سیاسەتـی دوێنـێ نیە ؟ سیاسەتیش مێژووی سبەینێ نیـە ؟ ، هـەر بۆیـە کۆلنجـوود دەیـوت " مێژوو تەنها دەبێت فەیلەسوفەکان بینوسن " ٥ .

فەیلەسوفانی مێژوو نەیاندەویست لێکۆڵینەوەی مێژووی تەنها ببێت بـە کۆمەڵێک جەنگ و پەیماننامەی سیاسی و روداوگەلی یەک لە دوای یـەک بـە بێ ئەوەی قولایی و هۆکـاری ئـەو روداوانـە دەربخـەن ، هـەروەهـا ئامانجیـان ئەوە بوو کە لێکۆڵینەوەی مێژووی لە مێژووی سیاسی و سەربازیەوە بیگۆڕن و بیکـەن بـە مێـژووی ئـاوەدانـی ، مێـژوو پـەیوندیـەکـی بـەهێـزی لـەگـەڵ فەلەسەفەدا هەیە ٦ .

فەلسەفەی مێژوو بابەتێکە لەو بابەتانەی وەک زانستی کۆمەلایەتی لـە دوای شۆڕشی فەرەنساوە لە دوای سەدەی هەژدە بە دواوە گەشـەی کـردووە و دەکرێت لێرەدا باسی چەند تایبەتمەندیەکی فەلسەفەی مێـژوو بکـەیـن کـە کـاری خۆیـەتـی و بـەدوایـدا عـەودالـە ( جـۆر و شـێوازی شـرۆڤە کـردن و لێکدانەوەی روداوەکانی مێژوو ، بە چیدا توێژینەوە مێژوویەکان لە جۆرەکانی دیکەی بابەتی زانینی مرۆڤ جیا دەکرێنەوە ؟ ، ئەو پرسیارانە کامانـەن کـە فەلسەفەی مێژوو دەربارەی بابەتـەکـە دەیانکـات و کۆشـشی وەلامدانـەوەیـان دەدات ) گـەر سـەرەنجـی ئـەو تیۆرانـە بـدەیـن کـە دەربـارەی شـرۆڤە و لێکدانـەوەی مێـژوو کـراون ئـەوا دوو جـۆرن ( لێکدانـەوە و شـرۆڤەی ئامانجەکەی کە ئەمە زیاتر لە فەلسەفـەی هیگڵـدا دەردەکـەوێـت کـە مێـژوو ناوەستێ تا بە ئامانج دەگات ، لێکدانەوە و شرۆڤەی هۆیەکی ئەمەیـش وەک ئـەوەی کـە تـۆینبی هزرمـەنـد هۆکـاری ئـاینی بـە هۆکـاری گۆڕانکـاری و پەرەسەنـدنی شارسـتانیەت و مێـژوو دەبینـێ ) ، لـە دوو لاوە فـەلسەفـەی مێژوو لە بابەتەکانی تر جیا دەکرێتەوە ئەوانیش ( ئـەو میتـۆدەی بـەکاری دەهێنێ واتا رێگا زانستیەکانی توێژینـەوە ، بابـەتـی توێژینـەوەکـە واتـا ئـەو

کەرەستەی کە دەیکات بە جیهان بینینی خۆی ) ، ئەو پرسیارانەی لە چوار چێوەی فەلسەفەی مێژوودا دەکرێن بە سێ بەشەوە ( پرسیاری مێژوویی ، پرسیاری لۆژیک و میتۆدی مێژوویی ، پرسیاری پرۆسەی مێژووی ٧ .

لێرەدا دەکرێت بە کورتی ئاماژە بە هۆکارەکانی دامەزراندنی فەلسەفەی مێژوو بدەین کە ئەمەیش وامان لێ دەکات باشتر لەم بابەتە تێ بگەین :

١ – ئامانجی فەلسەفەی مێژوو دۆزینەوەی حیکمەتە یان ئەو مانایەی ڕووداوەکانی مێژوو دەبزوێنێ لە پێناو بە دیهێنانیدا .

٢ – ( دیکارت ) تەماشای کرد کەوا مێژوو ، مێژوونوس بەرەو رابردوو کێش دەکا تا وای لێ دێت ئێستای بەلاوە نامۆ دەبێت ،بۆیە پێویستە بۆ مێژوونوس بە رووی ئێستادا بکرێتەوە و ئاگاداری فەلسەفەی نوێ بێ .

٣ – ئەو مێژوونوسەی لەژێر باری رابردوودا دەژی و بەسەر ئێستادا نەکرێتەوە ئەوا توشی بارێک دەبێ کە لە نەخۆش دەچێت وەک ئەوەی ( نیچە ) پێی دەڵێت " پەتای مێژوو " .

٤ – فەلسەفەی مێژوو تەنها قەرەبوی کەم و کورتیەکانی مێژوونوسان ناکات بەڵکو هەوڵی چارەسەری کەم و کورتیەکانی فەیلەسوفانیش دەدات ، فەلسەفەی مێژوو تەنها لەبەر دابین کردنی پێداویستیەکانی مێژوونوسان دانەمەزراوە بەڵکو بۆ جێ بەجێ کردنی پێداویستیەکانی کۆمەڵگە دامەزراوە ٨ .

فەلسەفەی مێژوو گەڕانە بە دوای کۆمەڵە بنەمایەکدا کە پەرەسەندنی کۆمەڵگە مرۆییەکانی لەسەر بەندە ئەویش راڤەکردنی رەوتی مێژووە لە ژێر تیشکی دیمانەیەکی گشتی ، وەک گشتێک بۆ روداوەکان نەک دابەش کردن ، بەم شێوەیە فەلسەفەی مێژوو بنەڕەتێکی فەلسەفی بۆ زانستی مێژوو دادەنێت ، فەلسەفەی مێژوو تەنها شەن و کەوکردنی ئەو ڕێبازەی کە

مێژوونوسـان دایـدەنـێن و گفتوگـۆکردن و شـی کردنـەوەی سـەرچـاوەکـان و توێژینەوەی زاراوەکانی مێژوونوسـان ناگـەیـەنێـت واتـا کـار کـردن تـەنهـا لـە رابردوودا بەڵکو فەلسەفەی مێژوو سنوری رابردوو تێ دەپەڕێنێت و ئێـستا و داهاتوو لە خۆ دەگرێت ٩ .

وەک جیاوازیـەک لـە نێـوان زانـستی مێـژوو وە فـەلـسەفـەی مێـژوودا دەتـوانین بڵێـین زانـستی مێـژوو ئاگـادار بوونـە لـە روداوەکـانی رابـردوو وە هەڵسەنگاندنی ئەو روداوانەیە بەڵام فەلسەفەی زانستی مێـژوو لـە چۆنیـەتـی توانا و و سنورەکانی زانستی مێژوو دەکۆڵێتـەوە ، ئـەو پرسـیارانەی کـە لـە زانستی مێژوودا دەخرێنە روو لـەم چـەشـنـەن : شۆڕشـی گـەورەی فـەرەنـسا کەی رویدا ؟ هۆکارەکانی چی بوو ؟ دەرئەنجامەکانی چی بوون ؟ کاریگەری لەسەر پیشەسازی چی بوو ؟کاریگەری لەسەر سیاسەت چی بوو ؟ هەروەهـا کاریگەری لـەسـەر وڵاتـانی تـر چـی بـوو ؟ بـەڵام ئـەو پرسـیارانەی کـە لـە فەلسەفەی زانستی مێـژوودا دەخرێنـە روو لـەم چـەشـنـەن : چـۆن دەتـوانین پێشبینی بکەین لە مێژوودا ، ئایا زانستی مێژوو زانستێکی ئەزمونیە ، ئایـا راڤـەی دیـاردە مێژووییـەکـان هاوتـای راڤـەی دیـاردە سروشـتیەکانـە ؟ ، بـە روونی دیارە کە جۆری پرسیارەکان لە هـەردوو بـەشـەکـەدا جیـاوازن کـە لـە جۆری یەکەمدا پرسیارەکان دەربارەی روداوە دەرەکییەکانن بـەڵام لـە جـۆری دووەمدا پرسیارەکان دەربارەی زانستێکە بە ناوی زانستی مێژوو ١٠ .

## فەلسەفەی مێژوو لای فەیلەسووفان و زانایان

لێرەدا بە کورتی و بەشـێوەیـەکـی پوخـت تیـشک دەخـەینـە سـەر رای چەند فەیلەسوفێک کە بۆچونیان سەبارەت بە ( فەلسەفەی مێژوو ) هەبـووە و لەم بوارەدا باس دەکرێن و کاریگەریان هەیە .

**ڤۆڵتێر ( ١٦٩٤ – ١٧٧٨ ) ز**

فرانسۆ ماری دو ڤۆڵتێر بە دامەزرێنەر و رابەری راستەقینەی بابەتی فەلسەفەی مێژوو دادەنرێت ، بە ناحەز و رکەبەرێکی سەرسەختی ئاینی مەسیحی سەردەمی خۆی ناسراوە و لەو باوەڕەدا بوو کە بیرۆکەی بەهرەی رەبانی زیانێکی گەورە لە پرۆسەی پێشکەوتنی سەربەخۆیانەی مێژووی داوە ، گەر چی بە دەگمەن نەبێت ڤۆڵتێر نەخراوەتە ناو خانەی فەیلەسۆفانەوە بەڵام سەرکەوتوانە توانیویەتی لە بەرهەمەکانیدا پوختەی بزوتنەوەی رۆشنگەری فەرەنسی بەرجەستە بکات ، لەم بابەتەدا دەکرێت جیهانبینی ڤۆڵتێر دەکرێ بە دوو بەش دابەش بکەین کە ئەویش لایەنی نەرێنی کە ئەویش بریتیە لە رەخنەگرتنی توندی لە ئاین و ئاینی مەسیحی و جولەکە و ئینجا تاوتوێ کردنی فەلسەفەی دیکارت و هێرش بردنە سەر بیر و راکانی رۆسۆ هەروەها لایەنی ئەرێنی کە ئەویش بریتیە لە بیروبۆچونەکانی دەربارەی مێژووی پەرەسەندن و کلتور و شارستانیەت و مرۆڤ ١١ .

مێژوو لای ڤۆڵتێر لە سەروی سەرگوزشتەی دەسەڵاتدارەکان و بارودۆخی نەتەوەکان و ئاینەکانی هەموو جیهانەوەیە ، هەموو نەتەوەکانی جیهان یەک و هیچیان هەڵبژێردراو نین و مێژوو بریتیە لە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی و بەم شێوەیە مێژوو بە بڕوای ڤۆڵتێر بریتیە لە پێشکەوتنی مرۆڤ لە لە تاریکی ئەفسانە و خەیاڵ بەرەو رۆشنای و دانای و ژیری کە ئەمەیش رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر دەبێت ١٢ .

**بە کورتی دەتوانین گرنترین بیروبۆچونی ڤۆڵتێر کە پێشکەشی فەلسەفەی مێژووی کردووە بیخەینە روو :**

١ – ڤۆڵتێر یەکێک بوو لەوانەی کە بڕوای بە ئەقڵ هەبوو لە بواری داهێنانە زانستیەکاندا کە لە سەردەمی رۆشنگەریدا پەرەی سەند ، ئەو بڕوای بە مرۆڤ هەبوو وە بڕوای وابوو کە جیاوازی لە ئەقڵی مرۆڤەکاندا نیە. بەڵام ئەو جیاوازیەی کە هەیە بە هۆی هۆکارەکانی وەک ( کەش و هەوا ، سیستەمی دەسلات ، ئاین ) ەوەیە .

٢ – ڤۆڵتیر و مێژوو نوسە ئەقڵانیەکان بڕوایان وابوو "گەردون و کۆمەڵگە بەشێوەیەکی ئالی بەڕێوە دەچێت".

٣ – ڤۆڵتێ بیرۆکەی چاودێری خواوەندی ڕەت دەکردەوە لە لێکدانەوەی مێژوودا.

٤ – ڤۆڵتێر هەوڵی دەدا ئەقڵ و تاقی کردنەوە بەکار بهێنێت لە پشکنینی ئەو زانیاری و هەوڵانەی کە پێی دەگەیشتن و ئەو گومانی کردە ڕابەر بۆ هەڵبژاردنی ڕاستی شتەکان .

٥ – ڤۆڵتێر دەستی کرد بە ڕەخنەگرتن لە نوسینە مێژوویەکان بە تایبەت ئەوانەی کە پشتیان بە تەورات بەستووە وەک نوسینەکانی ( ئۆگستین ، یوسوی ) کە وا تەماشا کراون کە یەهودییەکان گەلی هەڵبژێردراوی خودان کەچی میللەتە دێرینەکانی ڕۆژهەلات پشت گوێ خراون .

٦ – ڤۆڵتێر دەستی کرد بە چاککردنی ساڵنامەی مێژووی ئەوروپی بە پێی جێگە و پایەی ئەقڵ ، واتا جیا کردنەوەی مێژووی ئەوروپا لە یەکدی ( ناوەڕاست و مێژووی یۆنان و سەردەمی ڕۆشنگەری ... ) کە ڕۆشنگەری بە گەشاوەترین سەردەمی مێژووی ئەوروپا داناوە .

٧ – ڤۆڵتێر هەولێ داوە لە دیدگای " جیهانی – شارستانی ) یەوە مێژوو بنوسێت نەک بە پێی مێژووی ئەوروپا ، هەر بۆیە ئەو گرنگی بە شارستانیەتی میللەتە کۆنەکانی عێراق و میسر و چینی و هندییەکان داوە و داوایشی کردووە گرنگی بە مێژووی گەلە سەرەتاییەکان بدرێت ١٣.

مێژوو زنجیرەیەکی توندوتۆڵی ئەڵقە بەیەکەوە گرێ دراون ، ئەوەی ئەمڕۆ ڕوو دەدات لە ڕووداوێکی ڕابردووە و لە ڕابردوو کەوتوەتەوە و دوا ڕۆژیش هەر لەو دەکەوێتەوە ، مێژوو بریتیە لە پرۆسەیەکی هەمیشەی گۆڕانی فرە ڕەنگ و بەرەو پێش چون ، هیچ شتێک نیە نەگۆڕێ و لە دەستی گۆڕان و یاساکانی دەرباز بێ بەلام ئەمە هۆکاری سروشتی و مرۆی هەیە و هیچ بەهرەیەکی سەروی سروشت دەستی لەو کارەدا نیە ١٤ .

لەبەر رۆشنای ئەوەی کە باسمان کرد هەندێک لە مێژوونوسان و لێکۆڵەران دەنوسن کە ڤۆڵتێر یەکەمین کەسە کە بناغەی مێژووی شارستانیەتی داناوە بە مانا نوێیەکەی ، ( ویدجیری ) لە کتێبەکەیدا دەڵێت " ڤۆڵتێر مانای مێژووی لە زانست و هونەرە جوانەکان و ئەدەبدا دەبینی ١٥ .

## ڤیکۆ ( ١٦٦٨ – ١٧٧٤ ) ز

ڤیکۆ ١٦ یەکەم هزرمەندە هەوڵی داوە بنەمای بابەتی فەلسەفەی مێژوو دابنێ لەوەدا لە جیاتی ئەوەی مێژوو بە نوسین و شرۆڤە کردنێکی سادە و ساکاری روداوەکان دابنێ بەڵکو هەوڵی داوە لەو پێوەندی و یاسایانە لێکۆڵێتەوە کە لە نێو روداوەکاندا بەدی دەکرێن و کەوتنەوەی ئەو ئامانجانەی کە لەو روداوانە دەکەونەوە ، ئەو بڕوای بەوە هەبوو کە لە پشت هەر دوو دیاردەی سەرسوڕهێنەری مردن و ژیانەوە مەبەستێکی نادیار و شاراوە هەیە کە زیاتر بە لای چاکەدا دەچێت ١٧ .

سەرە رای ئەوەی کە ڤیکۆ بە رەخنەگرێکی جدی لە بیری دیکارت سەبارەت بە مێژوو دادەنرێت هەروەها ئەو بە یەکەم مێژوونوسی ئەوروپی دادەنرێت کە خۆی تەرخان کرد بۆ دانانی بنەڕەت گەلێک کە میتۆدی لێکۆڵینەوەی مێژووی لەسەر دابمەزرێت و ڤیگۆ رەخنەگرتنی لە سروشتنی زانینی دیکارت بە دەست پێکی میتۆدی فەلسەفی مێژوویی دادەنرێت .

بەلای ڤیکۆوە ئەو هەڵانەی کە مێژوونوسان دەیکەن لە توێژینەوەکانیاندا ئەو هەڵانە سەرچاوەی هەموو هەڵەیەکن لە تێگەیشتنی مێژوودا کە ئەوانیش بریتین لە :

١ – زیادەڕۆی کردنی مێژوونوس لە هەڵسەنگاندنی ئەو سەردەمی توێژینەوەی لەسەر دەکات ، ڤیکۆ تێبینی کردبوو مێژوونوسان بە زۆری

زیادەڕۆی لە هێزی مەزنی ئەو سەردەمە دەکەن کە بابەتی توێژینەوەکەیانە .

٢ — لە خۆبایبوونی نەتەوەکان لەوەی کە هەموو نەتەوەیەک لە گرنگی دان بە مێژووی رابردووی خۆی هەوڵی رازاندنەوەی ئەو مێژووە بە پرشنگدار کردنی لای خۆیی خۆشەویستی دەکات .

٣ — لە خۆبایبوونی فێرخوازان کە بە پێی دەربڕینی ڤیکۆ لە شێوەی ئارەزوویەکدایە کە مێژوونوس هەیەتی .

٤ — هەڵەی پەیوەندیدار بە سەرچاوەکانەوە یاخود ئەوەی کە ڤیکۆ ناوی لێ دەنێت بە دوای یەکدا هاتنی (زانستی نەتەوەکان ) ، ئەو هەڵەیەیش ئەوەیە کە ئەگەر دوو نەتەوە پابەندی یەک سیستەمی هاوشێوە بن بێگومان ئەوا دەبێت یەکێیان ئەو بیرۆکە یان سیستەمەی لە یەکێکی دیانەوە وەرگرتبێت ١٨.

ڤیکۆ لەو باوەڕەدا بوو کە مێژووی ئادەمیزاد دەتوانرێت بخرێتە بەر پێوانە و لێکدانەوەی زانست و ئەو مێژووی ئادەمیزادی دەقاودەق لە چەشنی سروشت دەبینی کە بە زەبری ژمارەیەکی زۆر یاسا و چەسپاو دەبزوێت و دەگۆڕێت ، ئەو بۆچونەی کە ڤیکۆ خستیە سەر ( خولی مێژووی ) کە تا ئەمڕۆیش بەشێک لە مێژوونوسانی رۆژئاوا بڕوایان پێیەتی و لە نوسینەکانیاندا بەکاری دێنن بە شێوازی جیاواز ، لای ئەو بیرمەندە مێژوو بریتیە لە چوار قۆناغ ( باری دڕندەیی ، چاخی خواکان ، چاخی پاڵەوانان و دوا قۆناغیش چاخی ئادەمی ) و دوای بڕینی ئەم قۆناغانە گوایە کۆمەڵ دەکەوێتە هەرەس هێنان و روخان و دیسان لەسەرەتاوە دەست پێ دەکات و ئادەمیزاد هێزی بزوێنەری سەرەکی هەموو ئاڵوگۆڕی قۆناغەکانە ، ئەم تیۆرەی ڤیکۆ لە دوای مێژوونوسانی دوای خۆی کرایە خولی شارستانیەتەکان و بەم پێیە هەموو ژیانێکی ژیاری وەک تەمەنی مرۆڤ بە هەر سێ قۆناغی " منالی ، لاوی و پیری " دا تێپەڕ دەبێت ١٩ .

ڤیکۆ کە بیروبۆچونی خۆی دەخاتە روو پشت بە مێژوو دەبەستێت و بەمەیش دەیەوێت بەرپەرچی دیکارت بداتەوە چونکە دیکارت پشت بە ماتماتیک دەبەستێت نەک بە مێژوو و دیکارت لە ناو هەموو مەعریفەکاندا تەنها ماتماتیک بە مەعریفە دادەنێت و داکۆکی لێ دەکات و دەڵێت " لەوە زیاتر کە خودی خۆمان کردومانە هیچی تر بە تەواوی نازانین " و ئەم ووتەیەیش ئەو بنەما فەلسەفیە هاوبەشەیە کە لەسەردەمی ( بیکۆن ، هۆبز ، کانت ... ) ەوە دەست پێ دەکات ، ڤیکۆ ئەم پرۆژە تایبەتەی خۆی ناونا ( زانستی نوێ ) کە مەبەستی ( زانستی مێژوو ) ە و دەڵێت " ئەم زانستە هەر وەک زانستی ئەندازە خودی خۆی هەموو جۆرە پێوەرەکان دەگۆڕێت و بە پێی رەگەزە تایبەتەکانی خۆیان دایاندەنێت بە واقیعێتێکی یەکسان بەو واقیعێتەکەی کە پەیوەندیان بە مەسەلەی مرۆڤەوە هەیە و لە واقیعێتی خەت و خاڵ و هێڵ زیاتر دەگرێتەوە " ٢٠ .

دەتوانین تایبەتمەندیەکانی ( زانستی نوێ ) کە بە پرۆژەیەکی گرنگی ڤیکۆ دادەنرێت لە چەند خاڵێکدا کورت بکەینەوە و ئاماژەیەکی بۆ بکەین وەک ( چاودێری خوای ، فەلسەفەی دەسڵات ، یاسای سروشتی بت پەرستەکان ، مێژووی شارستانیەت ، مێژووی جیهانی ، پێشکەوت و هاوسەنگی ) ٢١.

تێبینیە میتۆدییەکانی ڤیکۆ لە بەهادارترین پشکداریەتیەکانی بووە لە توێژینەوەی مێژوویەکاندا ، سودی لە میتۆدی توێژینەوەی شیکاری رەخنەی باوی سەدەی ١٧ ی ئەوروپا وەرگرتووە و توانیویەتی هەنگاوێک لەو میتۆدە بەرەو پێشەوە ببات ، ئەویش بە زیاد کردنی دارشتنێتی لە پێناو توێژینەوەی مێژووی و پەیی بردن بە راستیەکانی ، هەر ئەمەیش وای کرد کە زۆرێک ڤیکۆ بە دامەزرێنەری فەلسەفەی مێژوو ناو زەند بکەن بەڵام سەرەڕای ئەمانەیش چەندین رەخنە ئاراستەی میتۆدی لێکۆڵینەوەی مێژووی ڤیکۆ دەکرێت لەوانە :

١ ڤیکۆ مەرجی زانینی راستیە مەتماتیکیەکان بە زانینێکی دڵنیای دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی مرۆڤ خۆی زانستی ماتمایکی لە رێگەی دانانی چەند رێسایەکەوە دروست کردووە ، لێرەدا ئەو رەخنەیە ئاراستەی ئەو تێڕوانینەی ئەو دەکرێت کە یاساکانی بیرکاری لەو رووە دڵنیایینین کە دەسکردی مرۆڤن بەڵکو لەو رووەوە دڵنیاین کە گوزارشت لە واقعی راستەقینە دەکەن بۆ نمونە کاتێک دەوترێت دوو نیوەی چوارە ئەوا مرۆڤ لە رێگەی هێماکانەوە کە خۆی دایناوە گوزارشت لە راستی دەکات .
٢ – یەکێک لە گەورەترین ناتەواویەکانی پرۆژەکەی ڤیکۆ ( زانستی نوێ ) ، پۆلێن کردنی مێژووە لەسەر بنەڕەتێکی ئایدۆلۆجیانە بۆ مێژووی پیرۆز کە مێژووی ( جولەکە و مەسیحی و مێژووی دونیایی ) ... ٢٢.

## شپنگلەر ( ١٨٨٠ – ١٩٣٦ ) ز

زۆربەی فەیلەسوفان و مێژوونوسان گرنگیان بە خودی چەمکی مێژوو داوە چونکە چەمکێکی فرە رەهەندە و مایەی گفتوگۆ لەسەر کردنە بەڵام دەبێت ئەم چەمکە لای شپنگلەر ٢٣ کە زۆرێک لە فەلسەفەکەی بۆ مێژوو و شارستانیەت تەرخان کردووە چی بگەیەنێت ؟ ، شپنگلەر سەبارەت بە مێژوو دەڵێت " مێژوو بریتیە لەو فۆرمەی بە هۆیەوە مرۆڤ تێ دەکۆشێت بۆ پەیپێبردنی بوونی زیندووی جیهان لە رووی پەیوەندی بە ژیانی مرۆڤەوە ، بەو هۆیەیشەوە دەتوانێت بگات بە حەقیقەتی قوڵ " لەو دەقەوە تێ دەگەین مێژوو لای ئەو چوارچێوەیەکە بۆ تێگەیشتن لە جیهان وەک هەبویەکی زیندوو کەواتە مێژوو پێک نەهاتووە لە کۆمەڵێک رووداوی بێ بنەما و بێ سود بەڵکو بەهاکەی ئەوەندە گەورەیە یەکسانە بە حەقیقەت .

ئۆرگانی راستەقینەی مێژوو بریتیە لە یادەوەری بەو مانایەی کە بریتیە لە وێنا کردنی رابردووی مرۆڤ و نەتەوە و جیهان کە وەک ئێستایەکی تەواوەتی دەپارێزرێت ، شپنگلەر یاداشت یان ژیاننامەی کەسێک

تەنها بە کۆکەرەوەی ژیانی ئەو کەسە نازانێت بەڵکو بە کۆکەرەو و رۆحی شارستانیەتێکی تەواوی دەزانێت ، یەکێکی تر لەو پرسانەی کە شپنگلەر دەیوروژێنێت ئەوەیە کە مێژوو بۆ کێیە ؟ یان کێ خاوەنی مێژووە ؟ هەر بۆخۆی وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و مێژوو بە هی هەموو کەسێک دەزانێت ، ئەو شارستانیەت بە یەکەی لێکۆڵینەوەی مێژوو دادەنێت و ئەمە ئەوە لە بیر ناباتەوە کە رۆڵی تاک لە مێژوودا لەبیر بکات ، کەواتە مێژوو تەنها بریتی نیە لە مێژووی سەرکردە و پاشاکان و تەنها ئەوان خاوەنی نین بەڵکو سەرجەم ئەو کەسانەی سەر بە شارستانیەتێکی دیاری کراون بەشدارن لەو مێژووەدا ٢٤.

فەلسەفەی شپنگلەر سەبارەت بە شارستانیەت مەیلێکی بونگەرایی ئاشکرای هەیە ، ئەم بۆچونە هەمیشە دژی ئەو روانینەیە کە حاڵەتە جیاوازەکان لە ژیاندا دەشارنەوە ، ویڵسن رایگەیاندووە بونگەرایی داوای ئەوە دەکات بە دیدێکی وا بۆ جیهان بڕوانین کە نێوانی زانست و هونەر یەک بخرێت و رازی نابێت سروشت بکرێت بە دوو بەشەوە ، مەبەستی ویڵسن کە دەڵێت شپنگلەر مێژوونوسێکی بونگەراییە واتا بونگەرایی شۆڕشێکە دژی لۆجیک و ئەقڵ و داوایەکە لە پێناو خۆرسکی دیدوبۆچونەکان ، شپنگلەر هەموو ئەوانەی خستوەتە ناو لێکۆڵینەوەی مێژوویەوە و حەزی لە مۆسیقا و شیعر دەکرد و هەمیشە ووتەکانی گۆتە و (نیچە ) ٢٥ ی بەکار دەهێنا ، ئەو لەو بڕوایەدا بوو ماتماتیک و زانست لایەنێک لە لایەنەکانی خەباتی نەفسی مرۆڤ پێک دەهێنن ٢٦.

لە لایەکی ترەوە دەرخستنی ئەو میتۆدەی شپنگلەر بەکاری هێناوە لە لێکۆڵینەوەی مێژوویدا کارێکی ئاسان نیە چونکە ناتوانیت میتۆدەکەی راستەوخۆ پەی پێبەریت هەر بۆیە زۆرێک لەوانەی لەسەریان نوسیوە رەخنەیان لێ گرتووە و ئەو رەخنەگرانە ئاماژە بەوە دەدەن ئەو شێوازەی ئەو خراپە و پڕە لە دووبارە بونەوە و ئاڵۆزی و شپرزەی ، هەندێکی تر

دەڵێن " لێکۆڵینەوە ناکات بەکرداری بەڵکو تەنها بڕیار دەدات و زۆر گوێ نادا بە هۆی هێنانەوە بۆ ئەو شتانەی کە بڕیاریان لەسەر دەدات " ،سەرباری ئەمەیش شپنگلەر بۆچونی خۆی هەیە سەبارەت بە پرسی میتۆد و چارەسەری مێژوو ، ئەو پێی وایە پێویستە سروشت بەشێوەیەکی زانستی چارەسەر بکرێت بەڵام مێژوو بەشێوەیەکی شیعری چارەسەر بکرێت چونکە لە نێوان مێژوو و شیعردا پەیوەندیەکی هاوخوێنی هەیە .

ئەو میتۆدە نوێیەی شپنگلەر پەسەندی دەکات ناوی لێ ناوە میتۆدی هیمای ( سیمائی ) ئەمیش بریتیە لەوەی کە مێژوونوس هەڵدەسێت بە نیشانە کردنی دیمەن و خوێندنەوەی روخسار ، هەر بۆیە لە دیمەنی روداوەکان هیمای ئەو رۆحە دەردەهێنێت کە روداوەکە لێوان لێوە لێی ، ئەم میتۆدە هەر وەک وێنەکێشانی کەسایەتیەکان وایە بەڵام وێنەکێشانێکی رۆحی ، شپنگلەر پێی وایە پێویستە مێژوو بەو شێوە بنوسرێت ، کەواتە مەبەست لە میتۆدی سیمائی خوێندنەوەی زیندوانەیە بۆ مێژوو بەم پێیە بێت خوێندنەوەی مێژوو مەعریفەیەکی خۆرسکە .

لای شپنگلەر لێکۆڵینەوەی مێژووی لە پێک هاتەی ناوکی مێژووی دەکۆڵێتەوە چونکە ئەو پێی وایە مێژوو زیندووە وەک ئەوەی کە هەندێک وێنای دەکەن بریتی نیە لە کۆمەڵە شتێکی مردوو و رواڵەتی بەڵکو ناوەڕۆکێکی هەیە کە تەنها بە لێکۆڵەری راستەقینە دەدۆزرێتەوە و پیشان دەدرێت ٢٧.

## هیگڵ ( ١٧٧٠ – ١٨٣١ ) ز

هیگڵ ٢٨ وەک ئنگلیز دەڵێت یەکەم کەسە هەوڵی داوە ئاڵوگۆڕە ناوخۆیەکانی مێژوو دەست نیشان بکات و زۆر زوو کەوتە بایەخدان بە مێژوو کە بە لای ئەوە لە سەردەمی گریکەکانەوە دەست پێ دەکات ، هیگڵ لەوە دەگەیشت کە کەس ناتوانێت رەوڕەوەی مێژوو بەرەو پاش بگەڕێنێتەوە ٢٩ .

تیۆریەکەی هیگڵ لەسەر ئەوە بنیاد نرا بوو کە مێژوو هیچ نیە جگە لە مێژووی هۆش و پێشکەوتنی هۆش کە ئەمەیش یەکسانە بە پێشکەوتنی مێژوو و گەلانی بێ هۆش کە ناتوانین بە گەلانی بێ هۆش بڵێین گەلانی ئازاد چونکە ئازادی دەست ناکەوێ تەنها لای ئەو کەسانە نەبێت کە هۆشیان هەیە و هەست بە گرنگیەکەی دەکەن ، بەم پێیە ئەقڵ جەوهەری مێژووە هەروەها جەوهەری مرۆڤیشە ، **مەبەستی هیگڵ لە بارەی فەلسەفەی مێژووە بە کورتی بریتییە لە :**

یەکەم : فەیلەسوفی مێژوو نابێتە رێگر لەبەردەم مێژوونوسی ئەزمونگەری لە لێکۆڵینەوەی روداوە مێژوویەکان ، مێژوو بریتیە لە رەنگدانەوەی گیانی ئەقڵ لە رۆژگارەکاندا .

دووەم : ئەقڵ جەوهەری مێژووە هەر وەک چۆن جەوهەری سروشتیشە لەگەڵ هەبوونی جیاوازیەکی گرنگ کە بریتیە لەوەی کە ئەو ئەقڵەی مێژوو دەبات بەرێوە بریتیە لە ئەقڵێکی ئاگا لە خودی خۆی کە مەبەست مرۆڤە ،هیگڵ وێنەی پێک هاتەی کە بۆ مێژوو بەکاری هێناوە بە سێ خاڵ لێک دەداتەوە ( سروشتی ئەقڵ کە ناوی لێ دەنێت گیان ، بەدیهێنانی ئەقڵ و ئەو شکڵەی کە گیانی تێدا بەرجەستە دەبێت ) ٣٠ .

هیگڵ بۆچون و سەرنجەکانی خۆی لەبارەی جۆرەکانی نوسینی مێژووە خستە روو لە پێناو گەیشتن بە سادەترین و چاکترین رێگە بۆ نوسینی مێژوو کە ئەمە ( رێبازی رەخنەی ) یە لە فەلسەفەی هیگڵ بۆ مێژوو :

١ – هیگڵ رونی کردەوە سێ رێگەی سەرەکی هەیە لە لێکۆڵینەوەی مێژوویدا لە رووی رێبازەوە کە ئەمانەن (مێژووی راستەقینە ، مێژووی نەزەری ،مێژووی فەلەسەفی ) .

٢ – هیگڵ ئاماژەی بەوە کردووە کە ئەوانەی لە گێڕانەوە و لێکۆڵینەوە رەسەنەکانەوە هاتون دەبێت لە داستان و حیکایەت و کەلەپوری میللی دوور

بخرێنەوە ، واتا هیگڵ زۆر بە تەنگ وردەکاری و بابەتی بوونەوە هاتووە لە لێکۆڵینەوەی مێژوویدا .
٣ — جۆرێک لە نوسینەوەی مێژووی بە بڕوای هیگڵ نوسینی ( مێژووی دیمانەی ) یە کە لێرەدا مێژوونوس ئەو روداوانەی کە دەیگێڕێتەوە ناژی بەڵکو ئەو سەردەمەی کە تێیدا دەژی تێی دەپەڕێنێت تا مێژووی سەردەمێکی دیکە بنوسێتەوە .
٤ — هیگڵ ئاماژەی بە وێنەیەکی مێژووی دیمانەی ( نچری ) کردووە ، ئەو مێژوویە کە لە پێناو بە دەست هێنانی پەند و ئامۆژگاری لە تاقی کردنەوەکانی رابردوو دەنوسرێت کە ناوی ناوە مێژووی کردەوەیی کە کاربەدەستان و فەرمانڕەواکان ئەرکی لێکۆڵینەوەی و خوێندنەوەی مێژوویان دەکەوێتە سەر شان بەڵام ئەوەی ئەزمون و مێژوو فێرمان دەکا ئەوەیە کە گەلان و حوکمەتەکان هیچ لە مێژووە فێر نابن .
٥ — بۆ خستە رووی سەرنجەکانی سەبارەت بە مێژووی دیمانەی ، هیگڵ جۆرێکی دیکە لە جۆرەکانی دیکە دەخاتە بەردەست کە پێی دەڵێت " مێژووی رەخنەیی " ئەم پیشاندانە لە تەرحکردنی نوسینی مێژوویی لەو جۆرەیە کە رووداوەکانی مێژووی خۆی ناخاتە روو بەڵکو ئەو گێڕانەوە جیاوازانەی مێژوو دەخاتە روو کە دەیان پشکنێ و رەخنەیان لێ دەگرێت و راستەیەکانیان رون دەکاتەوە .
٦ — هیگڵ وەک جۆری چوارەم روانیوتە ( مێژووی هزر ) کە ئەمەیش جۆرێکە لە جۆرەکانی نوسینی دیمانەیی مێژوو کە لەسەردەمی خۆیدا گرنکی پێ دەدرا کە بە قۆناغی گواستنەوە دادەنرا لە ( مێژووی دانانی) یەوە بۆ ( مێژووی فەلسەفی ) ٣١.

هیگڵ " مێژوو " لە مانایەکدا بەکار دەبات کە لە " فەلسەفەی مێژوو " جیاناکرێتەوە بە بۆچونی ئەو مێژوو بە مانای تۆمار کردنی روداوە مێژوویەکان نیە بەڵکو بە مانای هزری مێژووییە کە ئەمەیش بەو مانا دێت

كە مەبەست لە خوێندنەوەی مێژوو ئەوە نیە كە ئاگایت لە رووداوەكان هەبێت بەڵكو مەبەست ئاگادار بوونە لەسەر فاكتەر و ئاراستەی روودانی ئەو رووداوانە ، هیگڵ لە مانایەكی گشتیدا باس لە گەردون دەكات كە هەم مانای مادی و رۆحی گەردونی دەگرێتەوە و هاوكات لەسەر ئەو باوەڕە بوە كە سروشتی مادی لە گۆڕانی مێژوودا بەشداره بەڵام رۆح و گۆڕانی رۆحی بە فاكتەری سەرەكی گۆڕانی مێژووی دەزانێت ، لێرەدا دەتوانین بڵێین مێژوو خشتەی قۆناغە جۆر بەجۆرەكانی بەدەست هێنانی ئازادییە چونكە ئازادی جەوهەری رۆحە ، قۆناغە جۆربەجۆرەكانی ژیانی مرۆڤ لە قۆناغی سەرەتاییەوە تا قۆناغی ئەمڕۆی گوزارشت لەو ئازادییە دەكات ، لە راستیدا هیگڵ مێژووی جیهان بە مێژووی رۆح دەزانێت ، گەر بەم جۆرەی باسمان كرد ئامانجی مێژوو بەدەست هێنانی ئازادی بێت ئەوا بە بۆچونی هیگڵ ئازادی مرۆڤ بریتیە لە ئاگای و تێگەیشتن ٣٢ .

هیگڵ مێژوو پێناسە دەكات و لە هەر پێناسەیەكدا مەبەستێكی ئاكامی هەیە كە بریتیە لە سێ لایەن ( سنورداری واتا سنورەكان دیاری كراون و پایەندی مەرج دەبن ، مەبەستگەرایی واتا ئاراستە و ماناكەی تێكەڵە لە بابەتگەری و خودگەری واتا ماناكەی مەعقولێكە دەكەوێتە دوای رێكەوتە سەرزارەكیەكانەوە ، بە دەست هێنان واتا بەدەست هێنان و كامڵ بوون لەگەڵ سروشتدا واتا شێوەی هاوگونجاوی ناوەڕۆك ) ئەو سێ لایەنە پێویست و ئەقڵانین ، لێرەوە دەگەینە ئەوەی دوای ئەوەی فەلسەفەی مێژوو بوونی مێژووی مرۆڤی ئاشكرا كرد و مرۆی ناسی سنورێك بۆ مێژوو دادەنێت .٣٣

لە دیدگای هیگڵدا ئاشتی و ئاسودەیی هیچ كات لە دەقی مێژوویدا نەبووە ، ئایا بە پێچەوانەوە ناتوانرێت بڕوا بكرێت كە هەوڵدان بۆ پاراستنی ئاشتی خۆی هێمایەكە بۆ دەسەڵاتی مێژووسازی مرۆڤ ؟ ئایا ناتوانرێت بوترێت جۆش و خرۆشی ئەو كەسانەی كە هەوڵیان داوە رێگری دروست

بوونی شەڕ بکەن بەنرخترە لە چالاکی کەسێک کە ئاگری ململانیەکانی هەڵگیرساندووە ؟ وەڵامێک لە بارەی ئەم بابەتەوە لە بەرهەمەکانی هیگڵدا دەتوانرێت ئەنجامگیری لێ بکرێ و زەین رازی ناکات و ویژدانی ئەخلاقی مرۆڤ بە نیگەرانی دەهێڵتەوە و هەروەها دەمارگیری هیگڵ بۆ نەتەوەی جەرمانی ئەوا سەربەخۆی لەو فەیلەسوفە دەسێنێتەوە ٣٤.

هیگڵ مێژوو بە ئاشتی لێکدەداتەوە واتا ئاشتی لە هەر دوو جیهانی ( رۆحی ، زەمەنی ) بەم جۆرە لە چاخی ناوەڕاستدا زەمەنی دڕندەی و ئارەزوو بازی مرۆڤ کە دواتر لە چاخی نوێدا کە چاخی ئاشتیە رویدا لێرەوە جیهانی ئەقڵ و یاسا بنیاد نرا بەمەیش جیهانی رۆح دەستی لە زۆرداری هەڵگرت ، لێرەدا دەکرێت ئاماژە بە کۆتای مێژووەکەی هیگڵ بدەین کە پێی وایە مێژوو ی جیهان لە رۆژهەڵاتەوە بەرەو رۆژئاوا هەنگاوی ناوە و ئەوروپا واتا کۆتای مێژوو بەوشێوەی کە ئاسیا سەرەتاکەی بووە ، ئەوەی هیگڵ باسی دەکات ئەوەیە کە ئەم جیهانە بە کۆتا گەیشتووە " ئەوەتا ئەم مێژووە بە کامڵ بوون گەیشت واتا ئازادی ٣٥ .

یەکێک لە باسەکانی فەلسەفەی مێژوو لای هیگڵ ( دیالیکتیک ) ە کە ووشەیەکی وێنانیە و هیگڵ لە ئەفلاتۆنەوە وەری گرتووە مەبەستیش لەمە پرۆسە مێژوویەکانە کە بە پرۆسەی یەکتر هەڵوەشاندەوە بەڕێوە دەچێت واتا هەر ئاراستەیەک کە دەگاتە کۆتای ئاراستەیەکی تر لە دایک دەبێت و بەم جۆرە هەموو شتێک هەتا هەتای وا دەبێت ، سەرباری گرنگی هیگڵ بۆ مێژوو بەڵام چەندین رەخنەی ئاراستە دەکرێت سەبارەت بە فەلسەفەی مێژوو لەوانە ( نارەوای بۆچونەکانی لەسەر گەلانی نائەوروپی و چەندانی تر ... ) . ٣٦

**سەرچاوە و پەراوێزەکان:**

(١) ووشەی ( فەلسەفە ) لە بنچینەدا گریکیە ، مانای ( حۆشەویستی حیکمەت ) دەگەیەنێت و بەمەیش واتا فەیلەسوف گیرۆدەی حیکمەتە ، ئەفلاتۆن ( ٤٢٧ – ٣٤٧ ) پ . ز پێناسەی فەلسەفە دەکات و دەلێت " فەلسەفە کۆششی دۆزینەوە و گەڕانە وە زانینی حەقیقەتە " ، هەروەها سوقراتیش دەلێت " فەیلەسوفەکان ئەوانەن کە حەز بە بینینی راستیەکان دەکەن و بە دوایدا عەودالّن " ، لە کتێبی ( المدخل الی معانی الفلسفه ) باس لە خەسڵەتەکانی فەلسەفە کراوە و هاتووە " فەلسەفە مەعریفەیەکە خەسڵەتی پاکی و تەنهای هەیە ، گەڕان بە دوای زانیاریدا کاریکە لە ناخی مرۆڤدایە و سروشتیە ، فەلسەفە منداڵێکی دانایە و بەرهەمی رەخنەگرانەی عەقڵە و بیری ئازادییە ... ) ، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە

(١) د . عرفان عبدالحميد : المدخل الي معاني الفلسفة ، الطبعة الاولي ، الدار الشون الثقافية عامة ، بغداد ، ١٩٨٦ ، ل ٣٦ – ٣٩ .

(٢) عەبدولکەریم سرووش : زانست چیە ؟ فەلسەفە چیە ؟ وەرگێڕانی : سامان سەلاح ، چاپی یەکەم ، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی ، هەولێر ، ٢٠١١ ، ل ٣٩ – ٤١ .

(٣) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح : دەروازەیەک لە فەلسەفەی مێژوو ، وەرگێڕانی : دەوەن حەسەن ، چاپی یەکەم ، دەزگای چاپ و بڵاو کردنەوەی رۆژهەڵات ، هەولێر ، ل ١٨١ – ١٨٢ .

(٤) د . حەمید عەزیز : رەهەندە هەمەڕەنگییەکانی فەلسەفەی مێژوو ، گۆڤاری رامان ، ژمارە ( ١٧١ ) ، ئابی ٢٠١١ ، ل ٧٨.

(٥) پ . د . موحسین محەمەد حسین : سروشتی مەعریفە و فەلسەفەی مێژوو ، چاپی یەکەم ، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی ، هەولێر ، ٢٠١١ ، ل ٥٦ .

(٦) پ . د . موحسین محەمەد حسین : هەمان سەرچاوە ، ل ٥٧ و ٦٣ .
(٧) د . حەمید عەزیز : سەرچاوەی پێشوو ، ل ٨٩ — ٩١ .
(٨) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح : سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٨٠ — ١٨١ .
(٩) کامەران محەمەد : ڤیکۆ و فەلسەفەی مێژوو ، چاپی یەکەم ، چاپخانەی یاد ، سلێمانی ، ٢٠٠٦ ، ل ١٩ و ٢٠ .
(١٠) عەبدولکەریم سرووش : سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤١ و ٤١ .
(١١) د . حەمید عەزیز : سەرچاوەی پێشوو ، ل ٨٥ .
(١٢) عەبدولحسین زەرینکوب: مێژوو لە تەرازوودا ، وەرگێڕانی : د . قادر محەمەد حەسەن و سۆران بەهاو محەمەد ، چاپی یەکەم ، بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێڕان ، سلێمانی ، ٢٠١١ ، ٣٤٩ — ٣٥٠ .
(١٣) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح : سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٠٦ — ٣٠٩ .
(١٤) د . حەمید عەزیز : سەرچاوەی پێشوو ، ل ٨٥ — ٨٦ .
(١٥) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح : سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٠٩ .
(١٦) جیۆڤانی باتیستا ڤیکۆ لە ٢٣ی حوزەیرانی ١٦٦٨ ز لە ئیتالیا لە دایک بووە کە یەکێک بووە لە هەشت منداڵی پیاوێکی هەژار ، ڤیکۆ خوێندنی سەرەتای و دواناوەندی لە لە خوێندنگەی جێزویت تەواو کردووە ، ئەو زۆر لە کارەکانی ( ئەفلاتۆن ، تاکیتۆس ، بیکۆن ... )ی خوێندوەتەوە و زۆر کاریگەریان لەسەر جێ هێشتووە و ئەو توانی بۆ ماوەیەک وانە بڵێتەوە و خۆی بۆ خوێندن لە زانکۆی ناپۆلی خەریک بکات و نزیکەی نۆ ساڵ لە شارێکی ئیتالی بە ناوی ( ڤایتۆلا ) خۆی بۆ خۆ رۆشنبیر کردن و پەروەردە کردن تەرخان کرد ، ئەم بیرمەندە بە دەست هەژاری و نەخۆشیەوە دەیناڵاند و نەیتوانی کۆرسی یاسای زانکۆی تەواو بکات ، ڤیکۆ لە ساڵی ١٧٣٤ ز وەک مێژوونوسی پاشای ناپۆلی دەست نیشان کرا و لە تەمەنی حەفتاو شەش ساڵیدا لە ساڵی ١٧٤٤ ز کۆچی دوای کرد ، ئەو لە

بواری هونراوە و مێژوو و فەلسەفەدا بەرهەمی هەبووە ، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە - کامەران محەمەد :سەرچاوەی پێشوو ، ل ٧٢ — ٨٢ .

(١٧) د . حەمید عەزیز : سەرچاوەی پێشوو ، ل ٨٣ .

(١٨) کامەران محەمەد : سەرچاوەی پێشوو ، ل ٩٣ و ٩٩ — ١٠٣ .

(١٩) د . کەمال مەزهەر ئەحمەد : مێژوو ( کورتە باسێکی زانستی مێژوو وکورد و مێژوو ) ، چاپی دووەم ، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی هێڤی ، هەولێر ، ل ٦٧ و ٦٨ .

(٢٠) پ . د . موحسین محەمەد حسین : سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٠٢ و ١٠٣ .

(٢١) کامەران محەمەد : سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٢٨ .

(٢٢) کامەران محەمەد : هەمان سەرچاوە ، ل ١١٠ - ١١٣ .

(٢٣) فەیلەسوفی میسالی ئەڵمانی ئۆسواڵد شپنگلەر لە ساڵی ١٨٨٠ ز لە دایک بووە ، خوێندنی ئامادەیی لە قوتابخانەی ( هال ) تەواو کردووە و پاشان چوتە زانکۆی بەرلین و تایبەتەمەندی لە بواری زانستە سروشتیەکاندا تەواو کردووە و پاشان دکتۆرای خوێندوە و تێزی دکتۆراکەی لەسەر دەربارەی فەیلەسوفی یۆنانی ( هێراکلیس ) بووە لە ساڵی ١٩٠٤ ز ، سەربارى ئەو هەموو زانیاریەی کە هەیە بەڵام باس لەوە دەکرێت کە شپنگلەر هیچ بڕوانامەیەکی تایبەتمەندی ئەکادیمی نەبووە کە ئەمە ووتەی ( کۆڵن یۆڵسن ) ی فەیلەسوفی ئنگلیزیە و ئەو زۆر بە خراب و کورت بین وەسفی دەکات ، ئەم بیرمەندە چەندین بەرهەمی هەبووە جگە لە تێزی دکتۆراکەی چەندین بەرهەمی تری هەبووە لە بواری چیرۆک کە ناوی ( براوە ) یە ، گرنگترین کتێبی شپنگلەر بە ناوی ( ئاوابوونی رۆژئاوا ) یە کە سەرجەم فەلسەفەکەی تێدا کۆکردوەتەوە و ماوەی سێ ساڵ پێوەی خەریک بووە و لەم کتێبەدا بیروبۆچونی خۆی سەبارەت بە شارستانیەت بە گشتی و شارستانیەتی رۆژئاوا بە تایبەت نیشان داوە جگە لەوەی روخانی

شارستانیەتی ڕۆژئاوای بە هەبونێتی داناوە و هەر ئەمەیش وای کرد کە بۆ ماوەیەک ئەم کتێبە بڵاونەبێتەوە ، بەم شێوەیە ئەم بیرمەندە چەندین بابەت و ووتاری لە گۆڤارەکاندا بلاوکردەوە تا ساتی مردنی لە ساڵی ١٩٣٦ ز ، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە – مەریوان عەبدول : تێگەیشتنی شپنگلەر لە چەمکی کات ، گۆڤاری کۆچ ، ژمارە ( ١١ – ١٢ ) ، ٢٠٠٩ ، ل ٥٦٨ – ٥٧٣ .

(٢٤) مەریوان عەبدول : فەلسەفەی مێژوو لای شپنگلەر ، چاپی یەکەم ، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاو کردنەوەی سلێمانی ، سلێمانی ، ٢٠٠٩ ، ل ٥٩ – ٦٢ .

(٢٥) فردریک نیچە لە ساڵی ١٨٨٤ ز لە ئەڵمانیا لە دایک بووە لە بنەماڵەیەکی ئاینی و لەسەرەتای تەمەنیدا بە ئاینی مەسیحی کاریگەر بووە و پاش ئەوەی دەبێت هەژدە ساڵان لەو ئاینە هەڵدەگەڕێتەوە و ئەم هەر لەسەرەتاوە بلیمەت دەر کەوتووە و لە تەمەنیدا کەوتوەتە دوای خۆشەویسی ( سالومە ) ناوێکەوە و پاش ئەمەیش زۆر بە توندی دژی ژنان قسەی کردووە و پاش ئەوەی ژیانێکی مام ناوەند ژیاوە لە ساڵی ١٩٠٠ ز کۆچی دوای دەکات و پاش خۆی چەندین بەرهەمی بەجێ هێشووە کە گرنگترین کتێبی " وەهای گووت زەردەشت " ە و بەرهەکانی تری وەک ( دەجال یان دژە مەسیح ، ئەمەیە مرۆڤ ... ) ، ئەم فەیلەسوفە بۆچونی بۆ مێژوو وەک زۆرێکی تری وەک ڤیکۆ و ئیبن خەلدون ئەوەیە کە بەشێوەی خول دەگوزەرێ و ژیان بەردەوام دەبێت و کۆتای نایەت ، نیچە وتەیەکی بەناوبانگی هەیە بۆ مێژوو ئەویش ئەوەیە " بە تەنها ئەوە پێناسە دەکرێت کە مێژووی نیە " و ئەو دەیوست مرۆڤ لە مێژوو رزگار بکات و مێژوو بە درۆ وەسف دەکات بۆیە پێویست ناکات مرۆڤ لە مێژوو تێ بگات ، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە – ويل دورانت : قصة الفلسفة من افلاتؤن الي جون ديوي ، ترجمة : فتح الله محمد ، الطبعة الاولي ، منشورات مكتبة المعارف ، بيروت ، ٢٠٠٤ ، ل ٣٠٨ – ٣٧٠ .

(٢٦) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح : سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٨٣ .
(٢٧)مەریوان عەبدول : فەلسەفەی مێژوو لای شپنگلەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥١ — ٥٨ .
(٢٨) جۆرج ولیم فریدرک هیگڵ لە ٢٧ ی ئابی ساڵی ١٧٧٠ ز لە ئەڵمانیا لە دایک بووە لە خێزانێکی مام ناوەند و خێزانەکەی لە تەمەنی سێ ساڵیەوە ناردویانەتە بەر خوێندن ، باوکی حەزی دەکرد کوڕەکەی ببێتە قەشە بۆیە ناردنی بۆ پەیمانگای ئاینی ( تۆنبگن ) و ئەو نەبووە قەشە چونکە بڕوای وابوو ئەوان دەمارگیر و بیر تەسکن، ئەو لەماوەی ژیانیدا دەستی کردە خوێندنەوەی بەرهەمانی رۆسۆ و مۆنسسکیۆ و نوسینەکانی کانت زۆر کاری تێ کرد بە تایبەت کتێبی ( ئاین لە سنوری ئەقڵدا و لەم کاریگەیەوە هیڵ کۆمەڵێک ووتاری نوسی و لە ساڵی ١٨٠٧ ز بڵاوبونەوە کە نوسینەکانی هێرش بوو بۆ سەر ئاینی مەسیحی ، پاش مردنی باوکی چووە شاری ( بینا ) و لەوێ دەستی کرد بە وانە ووتنەوە لە زانکۆ و رۆژنامەیەکی فەلسەفی دەرکرد ، لە ساڵی ١٨١٦ ز ژنی هێنا و دوو کوڕی لێ بوو لە کاتی مردنی وەزیری فێرکردن داوا لە هیگڵ کرا ئەو پۆستە پڕ بکاتەوە و بەم شێوەیە هیگڵ لەسەرتاسەری وولاتدا ناوی دەرکرد ، ئەم فەیلەسوفە لە نێوان ساڵانی ١٨٢٢ — ١٨٣٠ ز هزری خۆی لە وانە ووتنەوە لە زانکۆی بەرلین خستە روو کە دوای مردنی لە کتێبێکدا بڵاو بویەوە ، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە - دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح : سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٢٣ — ٣٢٥ .
(٢٩) د . کەمال مەزهەر ئەحمەد : سەرچاوەی پێشوو ، ٨٠ و ٨١ .
(٣٠) د . سعدون محمود ساموک : لە رێبازە هزرییە هاوچەرخەکان ، وەرگێڕانی: بوخاری عبدالله و نالی یوسف ، چاپی یەکەم ، دەزگای نارین ، ٢٠١١ ، ل ١٢٣ — ١٢٥ .
(٣١) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح : سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٣٥ — ٣٣٠ .

(٣٢) ئیبراهیم داد جو : مێژووگەری لە هزری هیگڵدا ، وەرگێڕانی : سامان کۆنە پوشی ، گۆڤاری سەردەم ، ژمارە ( ٥٨ ) ، بەهاری ٢٠٠٩ ، ل ٤٢ و ٤٣ .

(٣٣) هنری لوفیفر : هیگڵ و مارکس و نیچە لە بارەی مێژووە ، وەرگێڕانی : جەلال حەمید ، گۆڤاری ئایدیا ، ژمارە ( ٣-٤ ) ، کانونی دووەمی ٢٠٠٥ ، ل ٨٩ و ٩٣ .

(٣٤) د . کریم مجتهدی : هیگڵ و فەلسەفەی مێژوو ، وەرگێڕانی: رۆژان سەیفور ، گۆڤاری کۆچ ، ژمارە ( ١١ -١٢ ) ، ساڵی ٢٠٠٩ ، ل ٥٠٩ -٥١٠ .

(٣٥) د . محەمەد شێخ : هیگڵ و فەلسەفەی تازەگەری ، وەرگێڕانی : دلێر میرزا ، چاپی دووەم ، بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێڕان ، سلێمانی ، ٢٠١١ ، ل ٦٠٤ و ٦١١ .

(٣٦) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح : سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٢٩ و ٣٤٤ .

***

## نوسەر لە چەند دێڕێکدا :

سەباح عەلی جاف

لە دایک بووی ١٩٨٣ ی شاری کەلار .

لە ساڵی ١٩٨٩ لە قوتابخانەی شێروانە دەچێتە بەر خوێندن لە کەلار و هەر لەو شارە قۆناغەکانی سەرەتای و ناوەندی و ئامادەی تەواو دەکات .

لە ساڵی ٢٠٠٣ بەشی کۆمەڵایەتی – پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی کەلار بە یەکەمی سەر بەشەکەی تەواو کردووە ، ئێستا وەک مامۆستای مۆڵەت دراو لە بەشی مێژووی – زانکۆی گەرمیان درێژە بە خوێندن دەدات .

لە ساڵی ٢٠٠٠ ەوە دەستی داوەتە نوسین و کاری رۆژنامەوانی و لە زۆرێک لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی وەک ( کوردستانی نوێ ، ئاسۆ ، هاوڵاتی ،رامان ، والاپرێس ، گەرمیانی ئەمڕۆ ، بەرەوشار ، ژیانەوە ، هەفتانە ، وارڤین ... ) کاری کردووە ، چەندین ووتار و لێکۆڵینەوە و شیعر و چیرۆک و کاری رۆژنامەوانی بڵاوکردوەتەوە ، بەم هۆیانەوە چەندین خەڵاتی رێزلێنانی وەرگرتووە .

ئەندامی کارای سەندێکای رۆژنامەنوسانی کوردستان و ئەندامی فیدراسۆنی نێو دەوڵەتی رۆژنامەنوسانی جیهانە .

ماوەیەک بەڕێوەبەری رادیۆی تەوار بووە لە گەرمیان .

خاوەنی ئەم بەرهەمانەیە :

١ – پەروەردە و فێربوون گرفت و گۆڕان .

٢ – ئەنفال ٢٥ لە ١٠ رەهەندەوە .